# سەرچاوەی ئایین

یــا

کۆمەڵە دانراوە ئایینی یەکانی


مەلا عبدالکریمی مدرس


ئیمان‌و ئیسلام • ئەساسی سەعادەت • ئاوی حەیات
چل‌چرای ئیسلام • نوورو نەجات • ئیقبال‌نامە



---


بەغداد ـ چاپخانەی ئیرشاد ـ ١٣٩٣کۆچی ، ١٩٧٣ زایینی

# سەرەتا

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

خوێنەری کوردی بەرێز !

ئەم کۆمەڵە کتیبە کورتکورتانە ، کە جارێکی تر بە شێوەیەکی جوانتر دەخرێنە بەردەستتان ، هەریەکەی لە کاتێکی تایبەتیو باری جیاجیادا لەچاپ دراونو ، بەناو برا کوردە موسوڵمانەکاندا بلاو بوونەتەوەو جێی خۆیان کردوتەوە ٠

وا ئیستە لەبەر ئەوەی کە لە زۆر لاوە داوای لەچاپدانەوەیان لێ ئەکردمو ، بە نیازی ئەوەی کە بە شێوەیەکی فراوانتر گەلی کوردی موسوڵمان سوودی لێوەربگرن ، هەموویانم لە یەك بەرگدا چاپکردو ، چاوێکی پەلەم پیاخشاندەوە ٠ هیوادارم کە جێی رەزامەندیت بێتو ، خۆای بەخشندەو میهرەبان بیکا بە هۆی رێنموونیو سوودی گەلو ، ئیمەش لە تاوانی بێپایان عەفو بکاتو بمانخاتە ژێر باڵی بەزەیی خۆیەوە ٠

هێزو تواناو سەرکەوتن هەر لە خوداوەیە ٠

[ عبدالكريم ]

**بسم الله الرحمن الرحيم**

حەمدو ثەنای عام بو خودای عـەللام
صەلەوات لەسـەر سەییدی ئـەنام

حەزرەتی ئەحمەد صاحبی ئیسـلام
هەم لەسـەر ئالو ئەصحابی کیرام

(وبعد) فـەرزە لەسـەر خاص‌وعام
عیلم بە ئـەرکان ئیمان‌و ئیسـلام

**( الاسلام أن تشـهد ان لا اله الا الله وأن محمدا رسول الله ، وتقيم الصلاة ، وتؤتي الزكاة ، وتصوم رمضان ، وتحج البيت ان استطعت اليه سبيلا ) .**

ئەرکانی ئیسلام پینجن بـە قـەرار
ئـەووەل ئەمەیە کـە بکەی ئیقرار

بلێی ( أشهد ) ئـەزانم بـە دڵ
بـە زبان ئـەلیم خوشتر لـە بولبول

( أن لا اله ) هیچ مەعبوودی حـەق
نی‌یە ( الا الله ) مـەر ذاتی موطلەق

( واجب الوجود ) بی شەریك بی باك
مەوصووف بە کەمال ، لە خراپە پاك

( وأشهد ) هـەم ئەزانم یـەقین
بەزبان ئـەلیم بەحـەیاو تـەمکین

( ان محمداً ) مەمدووحی موختـار
لـە نەوعی بەشـەر موبارەك ئاثار

( رسول الله )ی فوروستادەی حــەق
بو سەر ئینس‌و جین نیك‌و بەد موطلەق

روخسار سپی‌و سوور ، لەطیف نوورانی
چاورەش‌و ظەریف ، گوشاد پیشانی

عەرەب ، قورەیشی ، هاشمی نەسەب
ئەشرەفی هەموو طایەفەی عــــەرەب

بی‌سیبەر ، وەك خور ، بالا موعتەدیل
نـــاوی ( محمد ) نــــەسبی عادیل

(عبدالله) ، (عبدالمطلب) ، (هاشـــم)
هـــــەم (عبدالمناف) ناســـینیان لازم

دایكی ئامینــــــــە كچی وەهەبـــــــە
ئـــەم كورری زەهرەی عالی حەســـەبە

موتەوەللید بوو لە مەككەی ئەووەر
لە چل سالەدا بوو بە پیغەمبەر (ص)

لـــەپاش چل‌ساله تا دوازدە ســـــال
دانیشت لە مەككە شای صاحیب ئیقبال

ئەوجار بۆ نەشـری حوكمی ئەمدینە
هیجرەتی فــەرموو چووبو مەدینــــــە

یاژدە ســــــال ماوە لــە دارالصـــــفا
لــــە شەصـــــتوس‌دا بوو موتەوففا

روكنی دووهەمین پینج فەرز بە ئەدا
گشت رۆژو شـــەوی بكەی بو خودا!

سی هــەم سەرفیطرەو ، زەکاتی مالی
به موستەحەق دان ، له مننەت خالی

روکنی چــوارەم روژووی رەمەضــان
پینجــــەم طــەوافی کعبــة الرحمان

لــه عومرا یەكجار فەرضـــە زیارەت
لەسەر موسولمان بەشەرطی طاقــەت

بو خـــەرجی ریگا کافی بی مـــالت
هـــەم بو نەفەقەی ئەهلو عــەیالت

**( والایمان ان تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورسله وباليوم الآخر وبالقدر خيره وشره ) .**

**١ ـ ان تؤمن بالله**

ئەصلی ئیمانیش شەشه به تەحقیق
ئـــەووەل ئەمەیه که بکەی تەصدیق

بزانی خـــودا ووجـــودی حـــەقه
قـــەدیمو باقی تـــەنهای موطلەقه

خوی بەخوی بووەو ، هــەروا ئەمینی
ئەمما غــەیری ئەو هیچ کەس نامینی

بی میثلو شەریك ، بیضیدو پیوەند
بیّ دایكو بی بـــاب ، بیژنو فرزەند

حاكمه بو ئەرز ، هــەم بو سەماوات
خالیقه لـــەبو هــەموو مــەخلووقات

نه جەوهەر ، نه جیسم ، نه وەکوو عەرەض
نه ئەبێ بـــە جێی حادیثەو مەرەض

جیهـــــەتو جیگە بو ذاتی نی یـــە
ذاتی لـــە ئەمروو سوبحەی بەری یە

کونهی ذاتی حەق لە عام مەستووره
ناوی شـــەریفی غەیره مەحصـــووره

گەرچی هەزارو یەکن بـــە شوهرەت
نەودونویان بە سوننەت موثبـــەت

نای بینی بەچاو هیچ کەس لـــە دنیا
لاکین صـــاحیبی مـــەرتەبەی عولیا

یەعنی (محمد) صـــاحیب عیززو تاج
خودای چاوپی کەوت لە شەوی میعراج

لـــە قیامەتدا ثابتـــە روئیـــەت
بو موئمین ، لە سەر حەدیثو ئایەت

وجـوهٌ یومئذٍ ناضـرَة الی ربهـِـــا حقـاً ناظرة

صیفاتی حـــەوتن ، قەدیمن وەك ذات
خاریجن لـــە دەرك عەقلی مەخلووقات

لـــە ذاتی پاکی حـــەق جیـا نابن
بوونو ، هـــەنو ، ئەبی هـــەر ببن

حەیاتو ، عیلمو ، ئیرادەو ، قودرەت
سەمعو ، بەصەرو ، کەلام بە صیحەت

زیندوی‌و ، زانین ، مەیل‌و ، توانین
بیستن‌و ، بینین ، گوفتوگوی شیرین

## ٢ ـ وملائکته

ئەصلی دووهەمین تەصدیقەو باوەرر
بە مەلائیکەی عەللامی ئەکبەر

جیسمیان لەطیفو ، شەریف ، نوورانی
پاك لە ظولومات ، قووەی نەفسانی

ئەتوانن لە خەلق خویان کەن ئیظهار
بەهەر صوورەتی شیرین‌بی‌و موختار

جاجار جوبرەئیل لە لای پیغەمبەر
بە رەنگی دوحیە دەبوو موصەووەر

گشت بەندەو موطیع موحبی خودا
لە کوفر بەریی ، خالی لە گوناه

نە نیرو نە می ، نە ژن‌و نە شوو
نە صاحیب پەیوەند ، نە بەوەلەد بوو

هیچ‌کەس نازانی مەر خودای ئەکبەر
عەدەدیان لە گشت مەخلووق زیادتر

لە ئاسمانا نی‌یە جی‌ی یەك پی
ئیللا مەلەکی حازرە لەوجی

یا لە رکووعان یا لە سجوودا
یا غەرقن لە ناو بەحری شهوددا

هەرچی مـەخلووقی خودای غەفووره
یەك مەلائیکەی لەســـەر مەئمووره

بـە ئەمری خـودای عەلیمو خــەبیر
تەربیەی دەکا بـە نەهجی تــەقدیر

لە روتبەی خویان قـەط ناچنـەدەر
باڵیـان یا دووه ، یا سیو ، زیـاتر

بەعضـــی بو بەهەشت خەزینەداره
بەســـەر ئەواندا (رضوان) سەرداره

نوزده طایەفـە ، یا نوزده نەفــــەر
رەئیسیان (مالك) مەئمووری سەقەر

کاتبی ئەعمـال عەدەدیـــان چـوار
دوو نەفەر بو شەو ، دوانیان بو نەهار

کاتبی چاکە لەســەر شــانی راس
بو شەرر لە لای چەپ بی خیلافو باس

ئـەووەل حاکمە ، دووەم مەحکوومە
دەلیلی ئەمـە تــەواو مەعلوومـــە

مەئمووری سوئال مونکەرو نــەکیر
هـەم عەذابی قەبر بو ئەهلی تەقصیر

لە مـەلائیکدا هـــەن چوار ئەصناف
مەحسووبن شەرعەن بە ناوی ئەشراف

ئەم چوارصینفە بوت ئەکەم بەیان :
ئەوەلیان مەشهوور بــە کەرروبییان

صینفی دووهەمین صینفی روحـــانی
سی هــەم حەمەلەی عەرشــی رەحمانی

عــەدەدیان چوارە لــە دەورەی دنیـــا
قیامەت هەشتن ، بــە ئەمری خودا

چوارەم موقەررەب بارەگای جــەلیل
ئەمانە چوارن بـــە نەهجی دەلیـــل

شەخصی ئەوەلیان ناوی ( جبرئیل )
حاملی وەحیــەو ، ئەمینی تـــەنزیل

دووەم ( میـــکائیل ) رزقی بەدەستە
هەم ئەمری زەوی ، قەبضە یا بەسطە

سی هەم ( عزرائیل ) قابیضی ئەرواح
مەئمووری زورن ، موطیعو مــەللاح

چوارەم (اسرافیل) مەئموورە بە صور
بە ئینتیظارە تا وەقتی دەســـتوور

صـــور شاخیکە ئەو فووی دەکا پیدا
بەقــەدەر ئــەرواح کونی واتیـــــدا

دووجار بەو شــــاخا لی ئەدا نەفەس
گشت زیندوو دەمرن بە ئەووەل نەفەس

بە دووەم نەفەس ســـەر دیننە دەر
بە ئەمری قەههار ئەرون بو مەحشەر

لاکین حەمەلەی عەرشـــی بەتــەمکین
ئەشخاصی مەشهوور بە موقەررەبین

پاش نەفخی ئەووەل ئەمرن سەراسەر
له پیش دووهەمدا سـەر دیننه دەر

عالەم ، لەوبـەینا ، چولو بـەطاله
ئەلین : ئەوبەینه موددەی چلسـاله

## ٣ ـ وكتبـه

ئەصـلی سیهەمین تەصـدیقەو باوەر
به صـەدو چوار کتیبی ئـەنوەر

قەدیمو ، صەحیح ، بی عەیبو عوتول
نازل بوون بو سەر ئەفرادی روسول

دەله سەر ئادەم ، پەنجا له سەر شیت
سی نازل بووه له سـەری ئیدریس

ده بـو ئیبراهیم ، صـەده تـەواوه
ئـەم صەد کتیبه صـوحوفیان ناوه

تەورات بۆ موسا ، زەبوور بو داوود
ئینجیل بو عیسـا به ئەمری مەعبوود

قورئان له هەموان ئەشرەفو ئەمجەد
نازل بووەته سەر حەضرەتی ئەحمەد

لـه وەقتی نـزول تا ئاخر زەمـان
بەسەریا نایی تەحریفو کـەتمان

جەمیعی جینو مەلـەكو ئینسـان
ناتـوانن بلین نـەظیری قورئـان

## ٤ ـ ورسلهِ

ئەصلی چوارەم تەصـــدیقەو باوەرر
صەدو بیستو چوار هەزار پیغەمبەر

موختاری خودان لـــەبو هیدایـەت
بیعیللەت بەمەحض فەضلو عینایەت

خودا هەناردی فیرقەی مورســـەلین
بو رەهنومایی ئـــەهلی ســەرزەمین

تەعلیماتیان کرد بە لەفظی شـیرین
بو ئینتیظـــامی کاری دنیـــاو دین

ئەصلو فەرعی دین ، ئەخلاقو سییەر
هەرچی نافیع بی بو نەوعی بەشـــەر

بیپەروا لە ئیش طەعنەی پرر وەحشەت
بیباك لە دوشمن ، بیخەوفو دەهشەت

بو دەلیـــل لەســـەر صیدقی ئەنبیا
موعجیزەی پیـدان خودا لـــە دونیا

## موعجیـــزه

موعجیزە کاری ئوممەت پێی نەکری
دەعوای نبـــوەتی پیتـــەرویج بدری

پیغەمبەر : پیاوی، حورر بی، لە بەشەر
شەرعی پیدابی عەللامی ئەکبــــەر
بەعەقلو ئەدەب ، عیلمو حیلمو خولق
لەناو هاوعەصران چاکتر بی لە خەلق

بو تەبلیغی شەرع گەر ئەمری هەیــە
ئەوە (رسول)ە ، وەر نا (نبی)یە

بزانە : لە ئەصـــل وەصفی نبووەت
لــەناو ئەنبیا نی‌یــە تــەفاووت

گەر بەیەکێکیان تو نەت‌بی تەصدیق
ئیمانت نی‌یــە راستی‌و بــە تەحقیق

نەبی‌ی لـــە خەودا قــەلبی بیــدارە
لــەپاش مردنی زیندوو هوشــــیارە

خـــاك نارزینی جیسمی پاکیــــات
ضـــەرەری ناگا بــە ئیدراکیـــات

هیچ کەس لە جینن‌و مەلەك‌و ئینسان
ناگاتە میزان مەرتەبــەی ئــەوان

ئـــەمما ثابتـــە لە بەینی خویـان
شەرەفی بەعضی لە سەر بەعضیکیان

ئەحمەدی موختــار رەئیس جــەمیع
باقی ئولولعەزم لــە بـاقی رەفیـع

نوح‌و ، ئیبراهیم ، موسا ئولولعەزم
عیساو ، موحەممەد بزانە بـە جـەزم

دروستە ، بەشەرع ، بلی‌ی ئەفضلەلە
لە غەیرە مورسەل هەرکام مورسەلە

سیصەدو سیزدە ، یا یازدە رەسوول
لە شەریعەتدا سی‌وسی‌یان مەنقوول :

ئادەم، شیث، ئیدریس، نووح، هوودی جەلیل
صالح ، ئیبراهیم ، لووط ، ئیسماعیل

ئیسحاقو، یەعقووب، یووسفو، ئەیووب
شوعەیبو ، مووسا رەسووڵی مەحبووب

هاوونو ، خضرو ، یوشەع ئیبنی نون
ئیلیاس، ئەلیەسەع، ذولکیفلو، شەمعوون

ئیشموییل، یوونس، داوودو، لوقمان
زەکەریاو یەحیاو ، شاهی سولەیمان

حەضرەتی عوزەیر ، عیسای بن مەریەم
لە پاش ذولقەرنەین سەییدی عالەم

لەسەر ئەوان بێ صەلاتو سەلام
بەقەد مەعلوومات ئیلاهی عەللام

بەڵام حەزرەتی ئەحمەدی موختار
لەسەر ئەنبیاو روسولە سەردار

چونکە شکستی هەرگیز نەهاوورد
لە غەزای دوشمن پشتی هەڵنەکرد

شەو بە بیداریی لەگەڵ جوبرەئیل
سواری بوراقبوو بە ئەمری جەلیل

لە مەککەوە تا ( بيت المقدس )
لەویوە هەتا بارەگای ئەقدەس

لە پاش گوفتوگوو خیطابی ظەریف
هەرشەو هاتەوە بو مەککەی شەریف

ئەوفەضلە خودا لەگـەل ئـەوی کرد
نابیتە بەیان بەصەد دەســـتو برد

خــودا ئەمری کرد بــــە پیغەمبەران
ئەگـــەر بیبینن پیی‌بینن ئیمــــان

وەرنە بفەرموون بە هەموو ئوممــەت
حاضر بن لەبو ئیطاعەی حـــەزرەت

هـەم ئــــەو خاتیمــە بۆ پیغەمبەران
دینی ناسیخە بو هـەموو ئـــەدیان

عیسا لە عەهدی مەهدی دیتە خــوار
دینی موحەممەد چاك دەكات ئیظهــــار

هەم ئـــەو رەحمەتە لـەبو عالەمین
مەبعووثە بوسەر ئینس‌و جینن یەقین

بەلام غــەیری ئــەو لــە پیغەمبەران
هــەریەك بو بەعضــــی رەوانە کران

هەم خاصەی ئەوە ئەووەل شەفاعەت
وەقتی زەلزەلەی روژی قیامـــــەت

کەوثەر ، وەسیلەو ، فەضیلەی عوليا
روئیــەتی خــودا لــە هەردوو دنیــا

ئەخلاقی باشــی سەییدی ســـــەروەر
هەم موعجیزاتی نابیتــە دەفتــــــەر

دینی شـــــەریفی خـــەیرولئەدیانە
ئوممــــەتی چــاكتر لــە ئوممەتانــە

## باسی خەلیفەکانی پیغەمبەر (د٠خ)

ئەعلای ئوممەتی رەفیقی شـــەفیق
خەلیفەی ئەووەل بووبەکری صەدیق

نـاوی عبدالله ، بـاوکی عوثمانـــە
بابای عامـــیرە ، باشـی بزانـــە

دایکی (أم الخیر) سەلمای کچی صەخر
کوڕری عامیری صاحیب عیززو فەخر

بە ئیجماعی عام پاش فەوتی حەزرەت
قـرار درا بوی روتبـەی خـەلافەت

دوو سالو سی مانگ، خەلافەتی کرد
لە سالی سیزدەی هیجرەت فەوتی کرد

عومری شەصتوسیی وەك (رسول الله)
مەدفوون بوو لە لای بە لوطفی ( الله )

خەلیفـــەی دووەم عومەری فاورق
مەحبوبی خودا ، خـەلیفەی مەوثووق

دایکی خـــەنتەمە باوکیشی خەطّاب
بابای نەوفەلە بە علیمی ئەنســـاب

بوو بە خەلیفە بە ئـــەمری صدّیق
بەیعەتیان پی کرد ئوممەت بە تەحقیق

دە سالو شەش مانگی خەلافەتی کرد
عومری شەصتوسی کـە وەفاتی کرد

له حوجرەی عولیای سەییدی سەروەر
لای ئەبوبەکر مەدفوونە عومـەر

حەزرەتی عوثمان صاحیب وەفاو بەین
خەلیفەی سی‌هەم ، لە قەب (ذی‌النورین)

باوکی عـەففانە ، بابـای ئەبولعاص
دایکی ئـەروا ناو ، بی‌خیلاف‌و باس

بە وەجهی شوورا جەزرەتی عومـەر
فەرمووی : خەلافەت ببی موقـەررەر

لە پاش مەشوەرەت پی‌یان‌کرد بەیعەت
دامەزرا لەسـەر روتبەی خەلافەت

ئیللا دوانزە روژ لـە دوانزە سـال
خەلافەتی کرد بـە عەدل‌و ئیقبـال

عومری هەشتاو دوو ، شەهید بوو رەفیع
نیژرا لـە خاکی ( جنّـة البقیع )

خەلیفەی چوارەم صـاحیب ئیشتیهار
حەزرەتی عـەلی ، حەیدەری کـەررار

شەریف‌و ، شـەجیع ، عالی مەطالیب
باوکی مەشهوورە بە ئەبوو طالیب

دایـکی فاطیمە کچی ئەسـەدە
زاواو ئاموزای حەزرەتی ئەحمـەدە

موددەی خەلافەی چوارسال‌و نومانگ
شەهیدکرا صوبح، عەینی وەقتی بانگ

عومری شەصتوس ، مەدفوونی کووفە
بەعضیکیش ئەلێن : غەیرە مەعرووفە

خەتمی خولەفاء حەرزەتی حەسەن
دوای ئەو حوسەین شەهیدی ئەحسەن

لە حەدیثایە عائیشەی حەمراء
خەدیجەی کوبرا ، فاطیمەی زەهراء

ئاسیەی عەذراء ، سەییدە مەریەم
چاکترن لە ژنان ئەولادی ئادەم

لە دوای ئەمانە ئەصحابی حەرزەت
ئەوانەی موژدەی پیدان بە بەهەشت

ئەمجار سیصەدو سیزدەی ئەهلی بەدر
هەم ئەهلی ئوحود، صاحیب فەضلو قەدر

لەوەپاش صەحبی ( بیعة الرضوان )
رضي الله عنهم الرحمان

بەم تەرتیبە فەضل بە بی خیلافە
بە دەئبی سوننەت ( حق الانصافە )

ئەبی هەموویان بەچاك بزانی
جەسارەت نەکەی گەر بە ئیمانی

## ئیمامەت

واجبە ئیمام بو قەومی ئیسلام
پیاویکی ئازاو ضابط بو ئەحکام

عاقل‌و عادل قوره‌یشــی نه‌ســه‌ب
ره‌شیدو شه‌جیع ، زور عالی حه‌سه‌ب

ئه‌ر مومکین نه‌بوو ذاتی وا جــه‌لیل
با شه‌خصی تر بی، ده‌خیل صه‌د ده‌خیل

تا خالی نــه‌بی ئیســـلام له ئیمـــام
صه‌ده‌مه‌ی زوره ، باقی والســـلام .

## ئیجتیهـاد

موجتــه‌هیدینی دینــی پیغه‌مبــه‌ر
عالم به کیتاب ، سوننه‌ت‌و ، سی‌یه‌ر

چواریان مه‌ذهه‌بیان ته‌دوین کــراوه
تــه‌قلیدیان بو عـــام جـائیز دراوه

ئــه‌بو حـــه‌نیفه ئیمامی ئــه‌ووه‌ل
مالیك ، شافعی ، ئه‌حمه‌د بن حه‌نبه‌ل

هه‌رکه‌س تابیع بی بــه یه‌کی له‌وان
بی‌خه‌طه‌ره‌یـه ؛ موصـیبن ئــه‌وان

## ئیعتیقـاد

شیخی ئیعتیقاد یه‌ك ( ابو الحسن )
دووه‌م (ابو منصور) ئیاممی ئه‌حسه‌ن

ئیهتیمامیان کــرد لــه ری‌ی خودادا
ئه‌م له سه‌مه‌رقه‌ند ، ئه‌و له بــه‌غدادا
به‌عه‌ینی ده‌ئبی صه‌حابه‌ی ســه‌له‌ف
به‌یانیان فه‌رموو عه‌قیده‌ی خه‌لـــه‌ف

هەرکەس تابیع بێ بە یەکی لـەوان
عەقیدەو دینی صـــەحیحەو جـوان

## ئــەولیا

طەریقی هــەموو ئـەولیا حــەقە
ئادابیان لەئــەل شــەرع مووافیقە

کەرامـەتیان بێ عـەددو شــومار
ثابتە بە شەرع ، دیســان بە ئاثار

هەرکەســـی کــاری ناموافیقــە
شەرعەن ، نەك وەلی ، بەڵکو فاسـقە

لــە ئـەهلی قیبلە کەســی بـەکافر
مەزانە ، تا کوفر لیی نــەبی ظاهیر

هەم لەعنەت لەسەر (مُعَیَن) هەرگیز
ئــەرچی کافر بی نــەدراوە جائیز

تا بەتــەحقیق و یــەقین نـەزانی
خەتمی بــە کوفرە ، نەك مووسلمانی

## ٥ ـ وباليوم الآخر

ئەصلی پینجەمین بــە ئیستیقامەت
تەصــدیقت ببی تو بــە قیامــەت

نیشــانەی زورە روژی قیامــەت
بوت بەیان دەکەم عومدەی عەلامــەت
خەسفی لە شەرقا خەسفی لە غــەربا
یەك لە جــەزیرەی عەرەبی عــەربا

برووزی فیتنەو ، کوفـری سوفیانی
ظهووری مەهدیو مەولای یــــەمانی

خروجی دەجـــال گومرای بەدئەنجام
نزوولی عیســا بو ئەراضیی شـــام

(یأجوج) و (مأجوج) هەم (دابة الارض)
دونیا دەگەررین، تەواو، طوولو عەرض

روژ لــە مەغریبو ســـەر دینیتە دەر
دووکەلیك دونیا دەگری سەرانسەر

ئاگری لە عەدەن باش دەکا ظهــوور
( فاسرافیل ینفخُ في الصــــــور )

ئــەم عەلاماتە دینەجی یەکســـــەر
( نطق بهـــا صــــحیح الاثـــر )

## ئەوزاعی قــەبر

بۆ مردوو دێتۆ ، لە قەبر ، حـــەیات
( یــدري الحســنات مع الســیئات )

نەکیرو مونکەر زور بــە ئیستیعجال
نازل دەبنە لای ، لیی‌دەکەن سؤال :

خودات ، رەسوولت ، ئیمامت ، دینت
کیی‌یــەو ؟ کامەیە ؟ چیی‌یــە ئایینت ؟

گـــــەر جوابی داوە ئازاو ئامـــادە
( فوراً ) قەبرەکەی دەبی گوشـــادە

دەبینی بــە چاو ، بەعەقلو بەهۆش
جێی خوی لە بەهەشت، زۆر شیرینو خوش

ئەگـــەر نەتوانی بەیانکا جــەواب
لێی ئەدەن بــەگورز ئامادەی عەذاب

غەیری جینو ئینس دەنگی ئەژنەوی
( فوراً ) بی غایەت قەبری تەنگ ئەوی

پالووی راستو چەپ ئەچن بەیەکدا
جێی خوی دەبینی لـــە جەهەننەمدا

بەعەذابی سەخت ، بەلاو نەدامــەت
گورفتار ئــەبی ، هــەتا قیامـــەت

## حەشــر

ئەمە ( برزخە ) تا وەختی مەحشــەر
ئــەوجا ( معادە ) تو بکــە باوەرر

ئەعضــاء دیتەوە لەگوشتو پیشـــە
خوینو پیستو موو هەم رەگو ریشە

وەك لە دونیادا جەمع ئەبین یەکجــار
ئەچین بو مەحشەر بە ئەمری قەهھار

## دەفتەری ئــەعمال

ئەمجار وەك طەیران بە نەصی ئەقوال
لە ئەطرافو دیت دەفتەری ئــەعمال
هەرکەس سەعیدە بە قەدرو شەرەف
ئەدریتە دەستی راستی بی ئەســەف

هەرکەس شەقی بی ئەخریتە مشتی
دەفتەر لەلای چەپ ، یا لە دوای پشتی

## حیسابی ئەعمال

جا ئەکری حیساب بو جینن‌و ئینسان
هەر عەمەلی بی : بەد بی یا ئیحسان

بەعضی لە نامەی عەمەل‌دا موثبەت
بەعضی ئەعضای خوی ئەدا شەهادەت

بەعضی گوناهان کەس نایان‌بینی
خودا بە عیلمی خوی دەینوینی

ئەوجار ترازوو دینن بو تەرجیح
ئەو ترازووە ، بەقەولی صەحیح ،

تای حەسەناتی وەك بەدری مونیر
تای سەیی‌ئاتی ظولماتە ، وەك قیر

سووکی بەرەو خوار ، قورسی بەرەوژوور
ئەروا ، بە عەکسی ترازووی مەشهوور

## عیقاب‌و سوئال

لەوەدوا خودای عەلیم‌و خەبیر
دیتە سەر عیقاب لە ئەهلی تەقصیر

پرسیار دەکا لە مەخلووق یەك‌یەك
لە بەنی‌ئادەم ، لە جینن ، لە مەلەك
لە جەمعی روسول دەپرسی موبین :
( بلّغتم حكمي للمكلفين ؟ )

له عوله‌مایان ئه‌پرسی یه‌کسه‌ر
له ئه‌مری مه‌عرووف، نه‌هی له مونکه‌ر

له عامه‌ی ئوممه‌ت ئه‌پرسی به‌عام
له ئیطاعه‌ی قه‌ول عوله‌مای ئه‌علام

ئه‌پرسی به قه‌هر له ئه‌هلی بیدعه‌ت :
بۆ داتان‌هینا فه‌سادو بیدعه‌ت

ئه‌مجا ئه‌مر ئه‌کا به جه‌زای ئه‌خیار
هه‌م به عه‌ذابی فه‌سه‌قه‌و ئه‌شرار

شه‌فاعه‌ت هه‌یه ، ئه‌یکه‌ن به‌بی شك
نه‌بی‌و ، وه‌لی ، صالح‌و ، مه‌له‌ك

روژی قیامه‌ت له بۆ گوناهبار
پینججار شه‌فاعه‌ت هه‌یه به قه‌رار

یه‌که‌م : ئیستیعجال بو جیگه‌ی حیساب
دووه‌م : ئاسانی‌ی سوئال‌و جه‌واب

سی‌هه‌م : خه‌لاص‌بوون له هه‌ولی مه‌حشه‌ر
چواره‌م : ده‌رچوونی که‌سی له سه‌قه‌ر

پینجه‌م بو ته‌رفیع مه‌قام له به‌هه‌شت
ده‌رجه‌ی به‌هه‌شت ئه‌گه‌یین به هه‌شت

موسلمان به‌پی‌ی عه‌مه‌ل‌و ره‌فتسار
له‌وده‌ره‌جانه بوی ئه‌دری قه‌رار

## ( صراط ) پرد

دوای ئەمــە پردی دائەنری بە راس
باریكتر لــەموو ، تیژتر لــە ئەلماس

جیگــەی ئەوپردە وا لەسەر ســەقەر
بەسەریا ئەكــەن مەخلووقات گوزەر

بــــەعضی دەخزین تا دەكەونە خوار
لـــــە جەهەننەمدا ئـــــەبن گوروفتار

بەعضی میثلی بەرق، بەعضی وەك بای وەشت
لی ی عوبور دەكەنم دەچن بو بەهەشت ٠

كە چوونە بەهەشت مەخلووقات یەكسەر
بە ئیستیراحەت ئەچنە سەر كەوثەر

## كــەوثەر

كەوثەر حەوضیكە ئاوی ئەو لە شییر
سپیتر ، بویشـــــی خوشتر لــە عبیر

هەركەس هەزار ساڵ لە جەهەننەم بی
موبتەلای ئیش‌و دەردو ئەلـــــەم بی

كە ئاوی خواردو لە حەوضی كەوثــەر
قەط تینووی نابێ بە ( نصّی خەبەر )

## بەهەشت‌و جەهەننەم

بەهەشت‌و سەقەر ئیستە مەوجوودن
لـــە قورئاندا زور زور مــەعدوودن

مەوقیعی بەهەشت لە ژور سەماوات
سەقەر لە زەوی ، لە ژیر طەبـەقات
بـەلام فەرموویە کوردی مـەعنەوی
(شیخ عبدالرحیم) لەقەب (مەولەوی) :
نەصیکی صـــوریح هیچ نی‌یە دیار
لـــەبو تەعیینی جیی جەننەت‌و نار
حـەق وایـە دەمیان هیچ لی نـەدری
تەفویض بە عیلمی ذاتی حـەق بکری

## ٦ ـ وبالقدر خیرِهِ وشرّهِ

ئەصلی شەشـەمین ئیمان بە قـەدەر
یەعنی هەرچی حەق کردی موقەددەر ـ
دیتـــە وجـودۆ بی کـــەم‌و زیـاد
خـالیق خودایـەو کاسـیبە عیبـاد
کەسبت لەبو کار ، بە مەذهەبی حەق ،
خـارجی ناکا لـــە ئیرادەی حـــەق
هـەرچی مەیلی بی خودا رووئـــەدا
هەرچی مەیل نەکا قـەط نابي پەیدا
گەر ئەهلی دنیا مەیل‌بکەن یەکسـەر
یەکموو کـــەم ناکەن یا خوود زیاتر
رازی‌یە بە خەیر نارازی لە شـــەرر
بو ئاســـانی کار ئـــەوە تەفیق‌دەر
ئەگەر مـەیلی بی ئـــەدات هیدایەت
بو ریگەی خەیرت ئەکا عنایـــــەت

کاری ئەنفەع بێ بۆ شەخصی کاسب
لەسەر ذاتی حـەق هیچ نیی یە واجب

ئەتوانی بیکا تـەعذیبی موطیـع ،
عاصـی بباتە مـەقامی رەفیـع

چۆن مالیکی موڵك موتەصـەرریفە
ئەمـە ئـەزانی هەرکەس عارفـە

هەموو تەکلیفی پێدەکری لە خـەلق
هیچ واجب نیی یە لەسەر ذاتی حەق !

خیلافی ئـەمە خیلافـەو جـەهلە
خـودا چیی دەکا فەضلە ، یا عـەدلە

وایە عـەقیدەی ئەربابی سـوننەت
( اصحاب الرسول ، آل الکرامـة )

(کەریم) بەم رەئیە لە حەق راجیی یە ـ
داخل بیتـە ناو فیرقـەی ناجیی یـە

یا رەهنومای خێر کاربەدەس ئاسـان
فەیاضـی موطلەق بۆ عامو خاصـات

بم بەخشە بە فەیض شاهی ئەنبیاء (ص)
بە نووری سینەی صافی ئەولیـاء

لادە لە قـەلبم رەشیی نەدامـەت
خاتیمەم بینە بـە فەیضو رەحمـەت

**رۆژی جومعە ـ دەهەمی مانگی رەمەزان**
**ساڵی ١٣٥٢ی کۆچی ـ خانەقای بیارە**

## بسم الله الرحمن الرحيم

لەپاش حمدو ثناي ذاتی خوا وە تقديمي صلاةو سلام بو روحي حضرتی محمد (ص) وە بو روحي هەمو آلو أصحابی بزانن : ئەمە دفتريكە ناوی ( ئەساسی سعادتە ) چەند سـؤالو جوابيكي دينيـەي تيدا نوسراوە بو شارەزايی مندالانی اسلامي كوردزبان • رجائەكەم خواي تعالى بيانكا بە ئەساسي سعادت واقبال •

**( الاسـلام أن تشهد أن لا اله الا الله وأن محمداً رسول الله وتقيم الصـلاة وتؤتی الزكاة وتصـوم رمضان وتحج البيت ان استطعت اليه سبيلا ) •**

ئەم حديثە مقدسە هەمو ئەركانی اسلامي تيدايە • با لەسەر ترتيبي ئەم كلامە زەريفە بروين بەريدا •

س١ ـ بناغەی اسلاميّت لەسەر چەند چشتە ؟

ج ـ بناغەی اسلاميّت لەسـەر پينج چشتە ، يەكەم دوو كلمەی شهادت • دوهـەم پينج فرضـەی نويژ لەهەمو شەوو روژيكا • سیهەم روژوی مانگي رمضان لە هەمو سـاليكدا • چـوارەم عطاكردنی زەكاتو سەرفطرە بـە مستحقان • پينجـەم حجو عمرە ، يانی طوافي بيت الله لە مكەی مكرمە ، بەوآدابە شرع بيانی كردوە :

**١ ـ أشهد أن لا اله الا الله وأن محمداً رسول الله •**

س٢ ـ معناي دوو كلمەی شهادەت چييە ؟

ج ــ معناى كلمەى يەكەم ئەمەيە بەدل باوەررم هەيە وە بە زبان اقرار ئەكم هيچ ذاتى نيە عبادتى بوبكري بەحق الا ئەوذاتە نەبى كە ناوي ( اللّٰه )يە ٠ معناي دووهەم ئەمەيە بەدل باوەررم هەيە وە بـــە زبان اقرار ئەكـــەم بەمە كە حضـــرتى محمد (ص) پيغەمبەري خوايەو ، خواي تعالى رەوانەى كردوە بە پيغەمبەرى بوسەر انسانو جنو ملائكە ٠

س٣ ــ نسبي پيغەمبەر (ص) كامە ؟

ج ــ پيغەمبەر (ص) كورى عبداللّٰه يەو ، عبداللّٰه كورى عبدالمطلبە ، عبدالمطلب كورى هاشمە ، هاشم كورى عبدالمنافە ٠ دايكى ناوى آمينەيە ، آمينە كچى وهب ، وهەب كورى عبدالمنافە ، عبدالمناف كورى زهرەى كورى كيلابە ، لـــە ميللەتى عەرەب وە لـــە طائفەى قريشن ٠

س٤ ــ پيغەمبەر (ص) لـــەكوى لەدايكبووەو بووە بە پيغەمبەر وە لە كوى متوفا بووە ؟

ج ــ پيغەمبەر (ص) لە شارى مكە لە دايكبووە، هەر لە شارى مكە لە عمرى چلســـالىدا بووە بـــە پيغەمبەر لەپاش چلســـالە دوازدەســـال لە مكەدا ماوەتەوە ئەمە پەنجاودوسال ، لەووختەوە تشريفى رويشتووە بو شارى (مدينەى) منورە يازدە ساليش لە مدينە بووە ئەمە شەستو سىسال لەوعمرەدا لە مدينە متوفابووە ٠ مرقدي مباركي لە شارى مدينەى منورەيە ٠

س٥ ـ هیئتی پیغەمبەر (ص) چون بووە ؟

ج ـ هیئتی زور جوان‌و شـیرین بووە شمایلي ذاتی مبـارکي قسـمیکی عادتی بووە قسـمیکی غیرەعادەتی ٠ اما ئـەو قسمەی کـە عادەتی بووە ئەمەیە : سەری مبارەکی گەورە بووە ، موی رەش بووە هەندی جار گەیشتوەتە سەرشانی وە بعضـی جار لەوە کەم‌تر بووە تاشیویەتی ، تەویلی پان بووە ئەبروی دریژو باریك‌و پر مو بوون ، چاوانی گەورەو رەش بوون برزانگیان زور بووە لە سپیائی چاوانیا خالیکی سور بووە ، اغلب تماشای زەوی کردوە روی مبارەکی گرد بووە رەنگی سورو سپی بوە ریشی پر بووە ، موی سپی لە بیست‌مو کەم‌تر بووە ، زبانی فصیح بووە ، دەنگی خوش بووە ، پیکەنینی تبسـم بووە ، هەرگز قهقهەی نەبووە ، لە وەختی شەونویژو قرآن خویندنا گریانی بووە ٠

وأماشمایلی غیرە عادەتی ئەمە بوە :

ئەگـەرچی ذاتاً بالای معتدل بووە لەگـەل هەرکەسی راوەستابی بالای لەوکەسە بەرزتر بووە ، لە هـەتاوا سیبەری نەبووە ، مخلوقي لـە پشتی سەرەوە بینیوە ، تفی شفای زام بووە ، چوار دفعـە حضرتی جبرئیل علیه السلام قلبی مبارەکی لـەت کردوەو شوری‌ویەتەوە وەپری کردوە لـە نوری معرفت : لە عمري سی‌سالی‌دا ، لە عمري دەسالی‌دا ، لە عمری چل‌سالی‌دا ، لە عمری پەنجاویەك‌دا ٠ لـە

ناوشانی‌دا بەلای چەپەوە موری نبوەت بووە بـــە قـــدری هیلکە کوتري ، علمای اســـرار فرمویانە لی‌ی نوسراوە ( تنجنج هیصور ) یعنی روبکە لە خوا بە راستی تو ذاتیکي نصرت دراوي . لـــە راوەستانا هـــەردو بـــەری دەستی گەیشتونەتە ئەژنوی ژیری پی‌ی ساف بوون ، بینی بـــەدەنی مبارەکی ئەوەندە خوش بووە لەهەر مجلسیکا دانیشتبی ئەو مجلسەی معطر کردوە .

## ۲ ـ ( وتقیم الصلاة )

س٦ ـ پینج فرضە لە چە وەختیکا واجب کراون ؟

ج ـ واجب کـــراون لـــە شـــــەوی معراجي بیست‌وحەوتەمی مانگی رجب‌دا سالیك‌و شــــەش مانگ لە پیش هجرتی حضـــرت (ص) لە مکەوە بو مدینـــە .

س٧ ـ ئەم‌فرضانە ناویان چي‌یە ؟

ج ـ ناویان ، صبح ، نیوەررو ، عصر ، مغرب ، عشایە .

س٨ ـ ئەم فرضانە یەکی چەند رکاتن ؟

ج ـ صبح دوو رکات ، نیوەرو چوار ، عصـــر چوار ، مغرب سی ، عشاء چوار .

س٩ ـ شرطی واجب بونی نویژ چي‌یە ؟

ج ـ شرطی واجب بونی سی‌شتە ، اســـلام ،

بلوغ ، عقل • کەوابی نویژو باقي احکام لەسەر کافرو مندالو شیت واجب نین •

س١٠ ــ شروطي نویژ چەندیکن ؟

ج ــ شروطی نویژ پینجن ، یەکەم پاکی بدنو لباسو جیگه نویژه له هەر پیسیه ، کە عفوي لی نەدرابی • دووهەمداپوشینی عورته ، که بو پیاو مابیني ئەژنوو ناوکەو ، بو ژن همو بدنه الا دەمو چاوو دستی نەبی ، که له نویژا عورت نین ئەما له غیري نویژ همو گیانی عورته لازمە درنەکەويو دایپوشی بو ئەوه گونەهبار نەبی • سیهەم دست نویژی ببیو جەنابەتو لەشگرانی بەسەرەوه نەبی • چوارەم هاتنی وقتي نویژەکەیه • پینجم رووکردنه له قبله •

(س ١٠) فرضی دەستنویژ چەندە ؟ (ج) فرضی دەست نویژ شەشن : یەکەم نیتی لابردنی بیدەستنویژیه لە وقتی شورینی دموچاوا • دوهەم ، شورینی هەموو دەموچاوه بەپانی مابینی هەردو گویچکەیە ، وه به دریژی مابینی موی سەرو انتهای چەناکەیه • سیهەم شورینی هەردو دەسته لەسەر پەنجەوه تا ئەوپەرری ئەنشك • چوارەم مسحي بعضیکه لەسەر • پینجەم شورینی هەردوپییه به هەر دو قولەپیوه • شەشەم رعایتی ئەمترتیبەیە •

س١١ ــ شروطی غسل چەندیکن ؟

ج ـ شروطی غسل دوانن · اول نیتی لابردنی حكمی لەش‌پیسی‌یە لە اول شـوورینی اعضـــاوە · دووەم‌شوورینی هەمو اعضایە چە پیست‌و چە مو ·

س١٢ ـ ئەوشتانە دەس‌نویژ ئەشكینن چەندن ؟

ج ـ ئەو شتانەی دەس نویژ ئەشكینن چوارن · یەكەم دەرهاتنی شتیكە لە پیش یا لە پاش · دوهەم نوستنە بەم‌شـــرطە ژیری خـــوی لـــە زەوی محكم نەكردبی · سی‌هەم ئەمەیە دەس بدا لە عورتی خوی ، یا عورتی كەسیك بەبەری دەست · چوارەم ئەمەیە پیستی ژن‌و پیاوی نامحرەم بەیەك بگەن ·

س١٣ ـ وەختی ئەم‌پینج فرضانە كامەیە ؟

ج ـ وەختی صبح لە روژەوەبون تا خور ئەكەوی · وەختی نیوەررو لە اولی لادانی روژە لـــە ناوەراستی آسمان هەتا سیبەری هەرچشتی بەقدری ئەوچشتەی لی‌بی بیجگـــە لە سیبەری وەختی استواء · وەختی عصرلەم‌وەختەوەیە تا خور آوا ئەبی · وەختی مغرب لە خورآوابونەوە تا سوری قەراغی آسمان گـــوم ئەبی · وەختی عشا لەم‌وەختەیە تا طلوعی فجر یانی روژەوەبون ·

س١٤ ـ ئەركانی نویژ چەندن ؟

ج ـ ئەركانی نویژ چواردەن : یەكەم نیتە یانی قصدی كردنی فرضی ئەو وەختە بەدل · دووم اللّٰه‌اكبر بەم شـــرطە لەگەل ووتنی ئـــەم لفظە نیتەكـــەی

لەدلدابی • سی‌هەم خویندنی فاتحەیە لە هـــەمو رکاتیکدا الا رکاتی کەسی نەبی کە امام لی‌ی‌پیش کەوتبی • چوارەم راوەستانە بو کەسی قدرتی ببی لە وەختی خویندنی فاتحەدا • پینجەم رکوعە یعنی دانەوینەوە ئەوندە انسان هەردو بـــەری دەستی بگاتە ئەژنوی • شەشەم اعتدالە یعنی بەرزبونەوە لەمحالە بو وضعی راوەستان • حەوتـــەم سجدەی اولە بەم‌نوعە هەردو ئەژنوی وە هەردو بەری دەستی وە هەردو سنگی پی‌ی وە تەویلی بەروتی لەسەر جیگە نویژەکەی دانی • هــەشتەم دانیشتنە لـــە پاش ئـــەم‌سجدەیە • نوهەم ســــجدەی دوەهەمە وەکو سجدەی اول • دەهەم قرارگرتنە لە رکوعو اعتدالو هەردو سجدەکانو دانیشتنی مابین‌یان • یازدەهەم تحیاتی آخر • دوازدەهم صلاواتە لەسەر حضـرت (ص) لەپاش تحیـــاتی آخر • سیزدەهەم ســـــلام دانەوەی اولە • چواردەهەم ملاحظەی ئەم‌ترتیبەیـــە کە بەیانمان‌کرد : مثلا الله اکبر لـــە پیش خویندنی فاتحەو خویندنی فاتحە بەرلە رکوع •

## ٣ ـ ( وتؤتی الزکاة )

س١٥ ـ زەکاة چەند نوعە ؟

ج ـ زەکاة دونوعـــە : اول زەکاتی ســــەرە کە مشهورە بە سەر فیترە ؛ دوەم زەکاتی مال •

س١٦ ـ سەرفیترە چەوەختی واجب کراوە ؟

ج ـ فرض کراوە لە مانگی شعبان لە ســـــالی دوهەمی هجرەتدا •

س١٧ ـ سەرفیترە بەچی واجب ئەبی ؟
ج ـ واجب ئەبی بە تەواوبونی مانگی رمضـــان لە هەموسالیكدا •
س١٨ ـ سەرفیترە لە سەركی واجبە ؟
ج ـ واجبە لەسەر هەمو انسانیكی حر ، كەزیاد لە نفقەی شەوو روژی جەژنی هەبی ، عطاكردنی سەر فیترەی سەری خوی‌و هەركەس نفقەی لەســـەری واجب بی ، وەكو ژن‌و مندالی ، یاخزمە تكاری كـــە اجرەی بوقرار نەدرابی •
س ـ مقداری سەرفیترە بوهەریەكی چەندیكە ؟
ج ـ مقداری سەرفطرە بوهەر كەسیك صاعیكە بە صاعی حضرتی پیغەمبەر (ص) لـــە هەرجیگەیی عیاری ئەوصاعە دەس كـــەوت باشـــە ، ئەگـەرنا بەحسابی كیشـــانە ســـەرفطرە ئەدری‌و ، وزنی ئەوصاعە چوارسەدو هەشتاو چوار مثقالە •
س٢٠ ـ زەكاتی مال چە وەختی فرض كراوە ؟
ج ـ زەكاتی مال فرض كراوە لە سالی دوهەمی هجرەتدا لەپاش فرض بونی سەرفطرە •
س٢١ ـ زەكات لە چە مالیكدا واجبە ؟
ج ـ زەكاة واجبەلە آلتون ، زیو ، مالی تجارت ، حوشتر ، گا ، مەرر ، بزن وە هـەر چشتی بو قوت بشی وەكو برنج ، گـــەنم ، جو ؛ زررات ، خورما ، میــوژ •
س٢٢ ـ شرطی زەكاتی آلتون‌و زیو چییە ؟
ج ـ شرطی زەكاتیان دوشتە یەكەم ئەمەیـــە

بگەنە حدی زەکاة • دوەم ئەمەیە لـە ملکی خاوەنیانا سال تەواو بکەن •

س٢٣ ـ حدی زەکاتو مقداری واجب لە آلتونو زیودا چییە ؟

ج ـ حدی زەکاتی ئالتون بیست مثقالە وە حدی زەکاتی زیو سەدوچل مثقالە ، کە گەیشتنە ئـەو ئـەندازە مقداری واجبیان ( ربع العشـرة ) یانی چواریك لە دەیك ، کە حاصلەکەی چل یکە : مثلا لـە بیست مثقال آلتون نیو مثقال وە لە سەدوچل مثقال زیو سیمثقالو نیو واجبە •

س٢٤ ـ زەکاتی مالی تجارەت چونە ؟

ج ـ مالی تجارەت وەکو آلتونو زیو واجبە سالی بەسەردا بسوورریتەوە ، وە بە هـەر پارەیی کرراوە بـە اعتباری ئەوپارەیە بگاتە حدی زەکات ، ئینجا بەوحسابە زەکاتی لیئەدری •

س٢٥ ـ شرطی زەکات لەمەررو بزندا چییە ؟

ج ـ زەکات لە مەررو بزندا واجبە بە سی شرط : یەکـەم ئەمەیە کـە بەدەمی خویان بلەوورەررین ، آلفیان نەدریتی • دوەم ئەمەیە عددیان بگات بـە حدی زەکات • سیهم ئەمەیە لە ملکی صاحبەکەیاندا سالیان بەسەردابیتەوە لە پلـەو حدی اولدا کـە چلسرە ، ئەما لە پلەی دوهمداتا چوارصـدو زیاتر لازم ناکا سالیان بەسەرا بیتەوە •

س٢٦ ـ حدی زکاتی مەررو بزن کامەیە ؟

ج ـ حدی زکاتیان چلسەرە کە گەیشتن بـە

چل‌سەر ، یەك‌سەر واجبە تا سەدوبیست‌ویەك سەر کە گەیشتن بە سەدوبیست‌ویەك سەر دوسەر واجبە تا دوسەدویك‌سەر کە گەیشتن بە دوسەدویك‌سەر سی‌سەر واجبە هەتا چوارسەد سەر کە گەیشتن بە چوارسەد سەر چوار سەر واجبە کە لەم‌عددە زیاد بو بەم‌حسابە لە همو سەدسەریکا سەری واجبە ٠

س۲۷ ـ شرطی زکاة لە قوتا چییە ؟

ج ـ شرطی ئەوەیە بگاتە حدی زکات بەم‌نوعە ئەوقوتانە کە بی‌تویکل هەل‌ئەگیرین وەکو برنج گەنم بگەن بەپینج ویسق‌و بە حسابی مثقال‌و وزن ، بە وزنی تەبریز دوسەدو بیست‌و پینج تبریزیەو ، بە پیوانەی حلبجە کە مسکنی خومانە ، نصابی زەکات ٤٥ تەنەکەیە وە ئەوانەی لە تویکل‌دا هەل‌ئەگیرین وەکو چەلتوك‌و پەررشەئەبی بگەن بە دە ویسق ٠ مع العلم زەکات هەر دەیەکە ٠

س۲۸ ـ مقداری واجب لە قوتا چەندیکە ؟

ج ـ واجب لەوانەدا بە باران یا بە جوگە آوبدرین ( عشرە ) یانی دەیك ، وە لەوانە بە دولچە آو بدری نصف العشرة یانی بیست‌یك ٠

س۲۹ ـ ئەوصنفانە مستحقی زکاتن چەندن ؟

ج ـ ئەوصنفانە هەشت صنفن لە قرآنی شریف‌دا بیان کراوون ٠

س۳۰ ـ لەوهەشت صنفانە لە زمانی ئیمەداچەند صنف هەیە ؟

ج ـ موجودیان چوارصنفە ، یەکـەمفقیر یانی کەسی نە مالی ببی نە کسب بزانی • صنفی دوهـەم مسکینە یانی کەسـی مالو کسبی ببی اما کفایتی نفقەی شرعیەی نەکا • سیهمقرضارە بەلام ئەگـەر بو نفقەی خویو عائلەی قرضار بوبی وەختی زکاتی ئەدریتی خوی نەتوانی قرضەکەی بداتەوە وە ئەگەر بو جیبـەجی کردنی احتیـاجی مسلمانان وەکو مهمـانداری یا اصـلاحی دوطائفەی دوشـمن قرضاربوبی ئەوە زکاتی ئەدریتی با خویشیدوەلەمەند بی • صنفی چوارەم مسافرە ؛ کەسی لە سەفەریکی حلالدا بی وەکو سفری تحصیلی علم یا صیلەی رەحم وە خوی مالی نەبی خەرجی بکات یا مالی ببیو دەستی پی نەگا ئەوە زکاتی ئەدریتی •

س۳۱ ـ لە وەختی زکاتدا نا چی واجبە لەسەر خاوەن مال ؟

ج ـ واجبە لەسەر خاوەن مال نیتی عطاکردنی زەکاتە کەیببی ، وەختی زەکاتەکە لە مالەکەی جیـا ئەکاتەوە یا لەووەختا تسلیمی مستحقی ئـەکا • وە نیتی وکیل کفایت ئـەکا لـە جیاتی نیتی خاوەن مـال •

## ٤ ـ ( وتصوم رمضان )

س۳۲ ـ روژو چە وەختی واجب کراوە ؟

ج ـ واجب كراوه له مانگی شعبان له ســـالی دوهەمی هجرتدا ٠

س٣٣ ـ روژو بەچی واجب ئەبی ؟

ج ـ واجب ئەبی بە تـــەواوبونی «٣٠» روژەی شعبان یا چاوپیکەوتنی هلالی رمضان ٠

س٣٤ ـ فرضی روژو چیه ؟

ج ـ فرضی روژو نیته له هەمو شـــەویکدا ٠ بەم نوعه هەمو شەویکی رمضـــان قصدی روژوی فرضی صبحەینیی رمضانی ئەوسالەی ببی ٠

س٣٥ ـ بەچی روژو ئەشکی ؟

ج ـ روژو ئەشکی بە جماع ، بە استمنا ، بـە خورشانەوه ، بـە داخل بونی شتی بو جوفی‌یانی‌بو ناوسکی یا ناوی گویچکەی یا ناوی ذکری ٠ بـــەم شرطه ئەو کەسه روژوەکەی لەفکردابی وه بە اختیار ئەمانه بکات ٠

**٥ ـ ( وتحج البيت ان استطعت اليه سبيلا ) :**

س٣٦ ـ حجو عمره چه وختی واجب بوون ؟

ج ـ واجب کراوون لـــە ســـالی شەشـــەمی هجرتدا ٠

س٣٧ ـ حجو عمره چەندد فعەواجبن له عومردا ؟

ج ـ یەك دفعه واجبن له عومردا لەسەر هـەمو فردی له مسلمانی مکلف ٠

س٣٨ ـ شی‌طی واجب بونی حج‌و عمره چییه ؟
ج ـ شـــرطی واجب بونی چوار شته ، بلوغ ، حریت ، قدرت : به‌م‌نوعه مقتدر بی به‌سه‌ر مصـرفی خویو عائله‌ی تا له‌وسفره دیته‌وه بو مه‌نزلی خوی وه امین‌بونی نفس‌و مال ٠

س٣٩ ـ ارکانی حج چه‌ندیکن ؟

ج ـ ارکانی حج شه‌شـــن یه‌که‌م‌احرامه یانی قصدی داخل بون له عملی حج‌دا له‌وموقعانه‌وه معلوم کراون ٠ دوه‌م وقوفی عرفه‌یه یانی مانه‌وه له ئه‌رزی عرفات‌دا له نیوه‌روی روژی نوهـــه‌می ذی الحجه‌وه تاطلوعی فجری روژی جـــه‌ژن با یك لحظه‌یش بی له‌ومده‌دا ٠ سی‌هه‌م طوافی مالی خوایــه یانی ده‌وره دان به ده‌وری مالی خودادا حه‌وت دفعه ٠ چوارم سعیه یانی راکردن له بینی صـــفاو مروه‌دا ٠ پینجم حلقه یا تقصیر یانی تاشینی موی سه‌ر یا کورته‌وه کردنی به مقص مثلا ٠ شه‌شه‌م ترتیبه به‌م نه‌وعه بیانمان کـــرد ٠

س٤٠ ـ ئه‌رکانی عمره چه‌ندیکن ؟

ج ـ هه‌رچی ارکانی حجه ارکانی عمره‌یشه الا وقوفی عرفات نه‌بی ئه‌وه بو عمره لازم نیه ٠ ئه‌مه‌ی که بیانمان کرد ارکانی اسلام بون لازمه له‌ســـه‌ر هه‌مو مسلمانی بیانزانی وه عمل‌یان پی‌بکا وه تعلیمی بکا به مندالی خوی ٠

مادام ارکانی اسلامت زانی با ارکانی ایمانیش

بيان بكه‌ين : حضرت (ص) فه‌رمويه‌تى ٠

**( الايمان أن تؤمن بالله وملئكته وكتبه ورسله وباليوم الآخر وبالقدر خيره وشره من الله تعالى ) ٠**

با له‌سه‌ر ترتيبى ئه‌م حديثه شريفه اركانى ايمان بيان بكه‌ين ٠

س٤١ ـ اركانى ايمان چه‌نديكن ؟

ج ـ اركانى ايمان شه‌شن (١) ايمان به خواى تعالى (٢) ايمان به ملائكه (٣) ايمان به‌و كتبانه خوا ره‌وانه‌ى فه‌رموون بو پيغه‌مبه‌ران عليهم الصلاة والسلام (٤) ايمان به‌و پيغمبرانه خوا ره‌وانه‌ى كردوون بوسه‌ر عباد (٥) ايمان به روژى قيامت (٦) ايمان به قضاءو قدر ٠

**١ ـ ( الايمان ان تؤمن بالله )**

س٤٢ ـ ايمان به‌خواى تعالى چونه ؟

ج ـ ايمان به‌خوا ئه‌مه‌يه به‌دل تصديق‌و باوه‌رت ببى كه خواى تعالى موجوده يانى وجودى هه‌يه ، ئه‌زه‌لى‌يه يه‌عنى ئه‌وولى نى‌يه ئه‌به‌دى‌يه ، يانى ئاخرى نى‌يه ، واحده يعنى تنهايه هه‌ر ئه‌وخالقه وه هه‌مو شتى دروست ئه‌كا هه‌ر ئه‌و عبادتى بو ئه‌كرى هه‌ر ئه‌و واجب الوجوده ، جسم نيه له چه‌ند أجزايه تيكه‌ل بى ؛ جوهر نيه يانى ماده‌ى نيه محتاج ببى به جيگه‌يى ، عرض نيه يعنى شتى نيه وه‌كو ره‌نگ محتاج بى به محلى ، جهت‌و محلى نيه يانى خواى تعالى

بەری یەلەمە کە لە جیگەیكدا وە یا لە ژور یا خوار وەیا مقابلی شتیك بی ، غنیە یانی بە هیچ‌شتی محتاج نیە وە هەموشتی محتاجە بەو ، لە کەسی بەولد نەهاتووە وە کەسی لی بەولد نەبووە هیچ شتی وەکو خوانیە وەهەر چە بەخیالی ایمەدا بی خوا وانیە ٠ والحاصل خوای تعالی بەری یە لە هەر چە عیبو نقصانە وە هەرچە صفتی کمالو چاکەیە هەیەتی ٠

س٤٣ ـ خوای تعالی چەند صفتی هەیە ؟

ج ـ خوای تعالی حەوت صفتی هەیە حیاة ، علم ، ارادة ، قدرة ، کلام ، سمع ، بصر ٠ صاحبی حیاتە یانی زیندوە نامری ، صاحبی علمە یانی هەمو شتی ئەزانی ، صاحبی ارادەیە یانی میلی لەسەر بونی هەرشتی ببی ئەبی وە میلی لەسەر هەرشتی نەبی نابی ، صاحبی قدرتە یانی قدرتی هەیە وە ئەتوانی هەر کاری ممکن بی بیکا ، صاحیبی کەلامە ، یانی صفتیکی ذاتیەی وەهایە کە ئەبی بە منشأی نازل‌کردنی وحی بو لای پیغەمبەران (ص) ٠ صاحبی سمعە یانی هەمو دەنگی ئەبیسی ، صاحبی بصرە یانی هەمو شتی ئەبینی ، وە ئەم صفاتانی خوایە وەکو صفاتی ایمە نییە ، مثلا: حیاتی خوا بە روحو بدن نیە ، علمو ارادی خوا بە دل نیە ، قدرتی خوا بە دەستو اعضاء دەرناکەوی ، کلامی خوا دەمو زبانی ناوی ، ببستنی خوا بەگویچکە نیە ، بینینی خوا بەچاو نیە ٠ هەر وەکو ذاتی خوا

بەحقیقەت ناناسری ئەم صفاتانەش بەحقیقت نەناسراوون ٠

س٤٤ ـ دلیل لەسەر وجودی خوا چییە ؟

ج ـ دلیل لەسەر وجودی ذاتی خوا ئەوەیە کە هەر کەسی تەماشای آثاری عالم بکا معلومی ئەبی کە عالم صانعیکی صاحب کمالی هەیە ، مثلا هەروەکو انسان تماشای بنائی یا نقشی گی کرد اقرار ئەکا بەمە ئەوبنایە بنائیکی بووە وە ئەو نقشە نقاشی کی هەیە ٠ مادام تماشای ئەجزای عالم بکا وەکو آسمانو روژو مانگو ئەستیرەو ترتیبی طلوعوغروبیان ، وەتماشای باو بارانو بحرو کیوانو معادنو نباتاتو حیواناتو انسانو اختلافی رەنگو زبانو مشربیان بکا معلومی ئەبی لەمعالمەدا صانعێکی بەکمال هەیە ٠

س٤٥ ـ دلیل لەسەر تەنهایی خوا چییە ؟

ج ـ دلیل لەسەر تەنهایی ذاتی خوا ئەمەیە مادام معلومبو کە کەسی هەیە صانعی ئەم عالمە بی هەر صانعی تو تماشای بکەی ئەگەر بی کمال بی ئەوە بو صانعیّت ناشیو ئەگەر لە هەمو عیبی بەریو صاحبی هەمو کمالی بی فقط ئەوە بو صانع کافیە ، ایتر اعتباری صانعیکی ثانی لغوە وە بیفائدەیە ، علاوە لەمە شرکتو تعددی مەلاك بە حسب عادت منشائی نزاعو جدالە ئەگەر صانعی عالم دوو بی اوضاعی بە انتظام نابی ٠

س٤٦ـ دلیل لەسەر ئەم حەوت صفتانە چییە ؟

ج ـ دلیل لەسەر ئەم صفتانە ئەمەیە ئەگـــەر ئەمصفتانە بو خوا نەبن ئەبی خلافی ئەمانەی ببی وە خلافی ئەمصفتانە ، وەکو مردنو عجزو جهل ئەوندە نقصن ادنابشری راضی نابی پییان ، کەوابو چون بو ذاتی خوا اعتبار ئەکرین ، علاوە ئەمترتیبو انتظامی عجیبە کە لە عالمدا تماشا ئەکرین بەبی علمو قدرتو باقی صفاتی کمالیە قابل نیە ببن ؛ کەوابی انســان ناچارە بــەمە تصــــدیقو باوەری ببی کە ذاتی خوا صاحبی ئەم حەوت صفتانەیە ٠

س٤٧ ـ خوا چەند ناوی هەیە ؟

ج ـ مشهور وایە خوای تعالی هەزارویەك ناوی هەیـــە ، فقط لەمناوانە نەوەدونویان لـــە قرآنو حدیثدا موجودن ، لــە هــەمویان گــەورەتر اسمی ( الله ) یە ٠

س٤٨ ـ خوای تعالی بە چاو ئەبینری یانە ؟

ج ـ بەلی لــە قیامتدا هـــەمو مسلمانی خوای چاوپی ئەکەوی ، بەلام لە دنیادا کەس نەیبینیوە الا حضرتی محمد (ص) ئەو لە شـــەوی معراجدا ذاتی خوای چاوپی کەوتووە بە نوعی بو انســـان تقریر ناکریت ٠

**٢ ـ و ( ملئکتــه )**

س٤٩ ـ ایمان بەملائکە چونە ؟

ج ـ ایمان بە ملائکە ئەمەیە تصدیقو باوەررت

ببی که ملائکه نوعیکن له مخلوقی خوا جسمیان لطیف‌و نورانی‌یه ، ئه‌توانن خویان ببه‌نه چه‌ند صورت‌و ره‌نگه‌وه دائماً وان له اطاعه‌ی خوادا لذت‌و الفت‌یان به ذکرو عباده‌تی خوایه ، معصومن له گوناه ، نه نیرن نه مین ، خوا میلی له دروست‌کردنی هه‌رمه‌لائیکه‌یه‌ببی به قدرتی خوی بی‌واسطه‌ی باوك‌و دایك خلقی ئه‌کاو هه‌رگیز خواردن‌و نوستن‌یان نیه ·

س٥٠ ـ ملائکه کارو ایشیان چیه ؟

ج ـ ملائکه غالب‌یان فقط عبادت ئه‌که‌ن به‌وطرزه عباده‌ته خوا امری پی کردوون وه بعضیکیان مأمورن له عالم‌دا له‌سه‌ر ارض‌و آسمان‌و باو باران‌و حیوانات‌و انسان‌و باقی موجودات ، وه قسمی مأموری سؤالی قبرن · هه‌ر که‌سی مرد مادام خرایه قبره‌وه یا له موقعی خوی‌دا به‌جی‌ما خوای تعالی زیندوی ئه‌کاته‌وه وه دو ملائکه روانه ئه‌کا بو لای سؤالی لی‌ئه‌که‌ن له خواو پیغه‌مبه‌رو دین‌و مذهب · ئه‌گه‌ر باش جواب‌یان بداته‌وه ئه‌وه درجه‌و مقامی باش ئه‌بی وه ئه‌گه‌ر نه‌زانی جوابیان بداته‌وه‌و ئه‌وه عذاب ئه‌دری به ئه‌ندازه‌ی گوناهی خوی وه یاخو عفو ئه‌کری ، وه ئه‌م عذابی قبره حقه به موافقی آیت · وه‌قسمی مأموری حشرو میزان‌و حساب‌و عذابن له قیامت‌دا ، قسمی مأمورن له‌بو عذابی جهنم · ئه‌مانه نوزده که‌سن یا نوزده طائفه رئیسیان ناوی مالکه ،

وەقسمی مأموری بەهەشتن رئیسی ئەمانە ناوی رضوانە ٠

س٥١ ــ آیا لە بینی ملائکەدا تفاوت لە فضل و شرفدا هەیە ؟

ج ــ بەلی چوار صنف لە ملائکە لە باقیەکانیان گەورەترن یەکەم صنفی کروبی ، دوەم صنفی روحانی ، سیهەم حملەعرش

یانی ئەوانە عرشیان هەلگرتووە ژمارەیان لە دنیادا چوارنو ، لە قیامتدا هەشتن ، چوارەم مقربین ٠ لەم صنفە چواریان ناویان معلومە ، یەکەم (جبرائیل)

مأمورە لەسەر هاوردنی وحی لە طرف خواوە بو لای پیغەمبەران علیهم الصلاة والسلام ٠ دووەم (میکائیل) مأموری رزق و برکتە لە دنیادا ٠ سیهەم

(عزرائیل) مأموری روح کیشانە وە چەند مأموری هەیە لە ملائکە بو قبضی ارواح ٠ چوارم (اسرافیل) مأمورە بە نفخی صور یانی مأمورە بە فوکردن بە صورا ٠

س٥٢ ــ صور چیە ؟

ج ــ صور شاخیکە بە عددی ارواحی ئەوانەی کە زیندون لە دنیادا کونی تیایە ٠ دوجار اسرافیل فو ئەکا بەوشاخەدا ، جاری اول هەرچی گیان لەبەرە ئەمرن وە کیوانی دنیا لە گەل ئەرزدا صاف ئەبن ، پاش ئەمدفعە بە مدەی چل سال دەفعەییکی تر فو

ئەکاتەوە بە صورا بەمدەفعە هەرچی مردوە زیندو ئەبنەوە وە ئەبرین بو محشر ؟

س٥٣ ـ جن چە نوعیکن لە مخلوق ؟

ج ـ جن طائفەییکن ئەصلاً لە آگر دروست کراون ئەتوانن خویان ببەنە چەند صورتو ەرنگەوە فرقیان لەگل ملائکە ئەمەیە ئەمان لە بدندا کثیفو لطیفیان هەیە ، خواردنو نوستنیان هەیە ، نیرومی یان هەیە ، کافرو مسلمانیان ، هەیە لەمسلمانە کانیش بێگوناەو گوناەباریان هەیە گوناەباریشیان لە جهنمدا عذاب ئەدرین ، وە ئەم طائفە لە پیش ئەوە آدم بکەویتە زەوی لەزەویدابوون ، وە ایستایش هەن لە دنیادا ئەوان چاویان بە بنی آدم ئەکەوی وە بنیآدم چاویان بەوان ناکەوی ، بەلام لە قیامتدا بالعکس ایمە ئەوان ئەبینین وە ئەوان ایمە نابینن ٠

س٥٤ ـ شیطان لە چی طائفەییکە ؟

ج ـ موافقی ظاهری آیتی قرآنی شریف شیطان لە طائفەی جنە وە لەاصلدا زور عبادەتی کردوە زور محترم بوە ، بەناو ملائکەدا ئەگەررا فقط لە وەختی کا خوا حضرتی آدەمی دروست کرد امری فەرمو بە شیطان سجدەی لیببا شیطان فیزی نوان ، اطاعەی خوای نەکرد ، لەوخصوصەوە خوای تعالی لە رحمتی خوی بیبەشی کردوەو لەعنەتی لی کرد ٠

س٥٥ ـ شياطين كين ؟

ج ـ شياطين ئەو جنی یانەن که اطاعەی خوای تعالی ناکەن وه تابعی شيطانن بو ضرردان له بنی آدم وه وەسوەسه خستن بەدلی مسلمانان، ئەم شياطينانه هەنديكيان لــــه اولادی شــيطانن ، وه هەنديكيان له اولادی باقی جنيەکانن ٠

## ٣ ـ ( وكتبــه )

س٥٦ ـ ایمان به کتب چونه ؟

ج ـ ایمان بــــه کتب ئەمەيـــه باوەررت ببی ئەوكتيبانــه نازل کراون بو لای پيغەمبەران عليهم الصلاة والسلام مەخصـــــوص لەطرفی ذاتی خواوه هاتوون وه له قبيلەی سحر و القای شياطين نين، وه به واسطەی حضرتی جبرئيلەوه نازل بوون به محفوظی له هەمو عيبی ٠

س٥٧ ـ ئـــــەو کتيبانه له طرفی ذاتی خــواوه هاتوون چەنديكن ؟

ج ـ ئەو کتيبانه سەدو چوارن ، ده بو حضرتی آدم ، پەنجا بو حضرتی شيث ســــی ی بو حضــــرتی ادريس ، ده بوحضرتی ابراهيم ٠ ئەوسەده مشهورن به صــــحف چونکه پەرەپەره نازل بوون ، توراة بو حضرتی موسی ، زبوربو داود انجيل بو حضرتی عيسی قرآن بو حضـــــرتی محمد المصـطفی عليهم الصـــلاة والســـلام ٠

س٥٨ ـ قرآن له چه‌ند سالا نازل بووه ؟

ج ـ قرآن له مده‌ی بیست‌و سی ســال‌دا به‌پی‌ی احتیاج نازل بوه ، یعنی له وه‌ختیکه‌وه حضرت (ص) بووه به پیغه‌مبه‌ر تا وه‌ختی که متوفی بوه · دوازده سال له مکه‌ی مکرمه وه یازده سالیش لــه مدینه‌ی منوره زادهما الله شرفاً ·

ئه‌وسه‌د صحیفه کــه‌بیانمان کردن فوتاون ، وه توراتو زبور به ساغی نه‌ماونه‌ته‌وه چونکه لــه‌پاش وفاتی انبیاء علماکانیان تیك‌یان دان وه له‌ســـه‌ر ئاره‌زوی بطالی خویان گورریان ·

اصلی انجیلی حضرتی عیسی نه‌ما وه‌چــــه‌ند نفری لــه‌پاش رفعی عیســـی به آره‌زوی خویان چــــه‌ند انجیلیکیان نوسی وه له پاش مده‌تی له‌ســه‌ر چوار انجیلیان اتفاقیان کرد وه ئه‌وانیش له بینی خویان‌دا مخالفن ، اما قرآنی شــریف له‌ووه‌ختــه‌وه نازل بووه هه‌تا امرو وه‌کو خوی بــــه محفوظی ماوه‌ته‌وه وه تا روژی قیــامت ئه‌مینیته‌وه وه حکمی قرآن ناسخی حکمی هه‌مو کتیبه‌کانه ، فقط به‌ته‌نها قرآن معامله دروســـته ·

## ٤ ـ ( ورســـله )

س٥٩ ـ ایمان به رسل چونه ؟

ج ـ ایمان به رسل ئه‌مه‌یه تصــدیق‌و باوه‌ررت ببی که خوای تعالی به محضی لطف‌و عنایت چــــه‌ند

انسانيكى له بشردا هه‌ليژاردووه‌و شريعتى پى‌داون وه امرى‌پى كردون به‌گه‌ياندنى ئه‌و شريعته به عبادى خـوا .

س٦٠ ـ شـــرطى پيغه‌مبه‌ر ئه‌مـه‌يه پياويكى « حرّ »بى ، يانى آزادو صـــاحبى صـــفات‌و اخلاقى حسنه‌و گه‌وره‌تر بى له هه‌مو هاو عصـرانى خوى ، به‌رى بى له علت‌و دنائت ، معصوم بى لـه گوناهى كبيره عمداً يا سهواً وه له گوناهى صغيره‌ى عمدى ، وه خواى تعالى اظهارى راستگويى پيغه‌مبه‌ران ئه‌كا به معجزة .

س٦١ ـ معجزه به‌چى ئه‌لين ؟

ج ـ معجـــزه كاريكه بـــه خلافى عاده‌ت خوا آشكراى ده‌كا له‌سه‌ر ده‌ستى پيغه‌مبه‌راندا ، له كاتى ئيديعاى پێغه‌مبه‌ريدا ، وه ئـــه‌و كارانه بـه غيرى پيغه‌مبـــه‌ران ناكرين وه‌كـو گفتوگوى حيوانات‌و تسبيحاتى به‌ردو سوجده‌بردنى دارو شـــه‌ق كردنى مانگ‌و خبردان به كارى غيبى .

س٦٢ ـ عددى ئه‌وپيغه‌مبه‌رانـه شـــريعت‌يان گه‌ياندوه به‌عباد چه‌نده ؟

ج ـ عه‌ده‌ديان‌سيسه‌دو يازده‌يه .

س٦٢ ـ له‌م جماعته ناوى چه‌نديكيان معلومه ؟

ج ـ لـــه قران‌و حديث‌دا ناوى «٣٠» كه‌سيان معلومه ، حضرتى آدم ، شيث ، ادريس ، نوح ، هود ،

صالح ، ابراهيم ، لوط ، اسمعيل ، اسحق ، يعقوب ، يوسف ، أيوب ، شعيب ، موسى ، هارون ، يوشع ، الياس ، اليسع ، ذو الكفل ، شمعون ، اشمويل ، يونس ، داود ، سليمان ، زكريا ، يحيى ، عزير ، عيسى ، محمد المصطفى صلوات الله وسلامه عليهم أجمعين • اما خضرو لقمانو ذو القرنين ئەوە تحقيق وايە بيغەمبەر نين بەلكو لە اوليان •

س٦٤ ــ رتبەی پیغەمبەران چونە ؟

ج ــ رتبەی پیغەمبەران لە غیری پیغەمبەران بەرزترە وە لە بینی خویاندا بعضی کیان لە بعضیکیان گەورەترن • من جملە پیغەمبەرانی اولو العزم یعنی ئەوانەیان صاحبی زەحمتو کاری پرمشقت بوون لە گەیاندنی شریعتدا وەکو حضرتی نوحو حضرتی ابراهیمو حضرتی موسیو حضرتی عیسیو حضرتی محمد المصطفی علیهم الصلاة والسلام لە باقیەکانی تر گەورەترن وە حضرتی محمد المصطفی (ص) لە هەمو پیغەمبەران گەورەترە بەچەند دلیل • وە لەبەر ضعیفی طبیعتی مندالان لەودلیلانە فقط (٥) دلیل بیان ئەکەین •

س٦٥ ــ دلیلی اول لەودلیلانە چییە ؟

ج ــ دلیلی اول ئەمەیە بە موافقی دلیلی نقلی تاریخیو شرعی معلوم بووە پیغەمبەرانی سابق هەریکی فقط بو میلەتیك رەوانە کراون ، اما حضرتی

محمد المصطفى (ص) ڕەوانە کراوە بو سەر هەمو ملتی عالم وە دعوتی هـەمو ملتو پادشاهانی دنیای کردوە بو اسلامیت وە آشکرایە پیغەمبەری ارشادی هەمو ملتی عالم بکا گەورەترە لەوە کە تەنها ارشادی ملتی بکا ۰

س٦٦ ـ دلیلی دوەم چییە ؟

ج ـ دلیـلی دوەم ئەمەیـە شـریعتو دینی پیغەمبەرانی سابق هەروەکو بو ملتی بووە فقط بو چەند زەمانی بووە وە لەپاش ئەو زەمانانە نسـخ کراونەتەوە بە دینو شریعتیکی تازە ۰ اما شریعتی حضرتی محمد (ص) هەر وەکو بو هـەمو ملتی عالم بووە بو هـەمو زەمانەیکیشـە وە تا ڕوژی قیـامت باقیـە ۰

س٦٧ ـ دلیلی سیهەم چییە ؟

ج ـ دلیلی سیم ئەمەیە شریعتی پیغەمبەری ایمە عبادەتی لە باقی شریعتەکان زورتر تیدا هەیە ؛ مثلا ئەو پینج فرضە نویژە لە هیچ شریعتیکی کەدا تەواو گرد نەبونەتەوە ۰

س٦٨ ـ دلیلی چوارەم چییە ؟

ج ـ دلیلی چوارەم ئەمەیە معجزەی پیغەمبەرانی سابق فقط لـە زەمانی خویاندا بووە ، اما معجزەی حضرەتی محمد (ص) لەپاش زەمانی خوی بعضیکیان ماونەتەوە وەکو قرآنی شریف کە یکیکە لە معجزاتی

قرآنی شریف‌هه‌یه له عالم‌دا هه‌مو وه‌کویه‌کن وه ابدا

س٦٩ ـ دلیلی پینجه‌م چی‌یه ؟

ج ـ دلیلی پینجه‌م ئه‌مه‌یه امتی پیغه‌مبه‌رانی سابق اغلب له زه‌مانی پیغه‌مبه‌ره‌کان‌دا یا له‌پاش زه‌مانی ئه‌وان اصولی دینه‌که‌یان گورریوه

وه‌اختلافیان تیدا په‌یدا کردوه . من جمله له عینی زه‌مانی حضرتی موسی‌دا دوای ئه‌و هه‌مو معجزه‌و زه‌حمته که قبولی کرد بنی اسرائیل له خوا په‌رستیه‌وه رویان کرده گویره‌که په‌رستی وه هه‌رچی بشاره‌ت

بو نبوتی حضرتی عیسی‌و حضرتی محمد علیهما الصلاة والسلام له تورات‌دا بو گورری‌یان وه اجماع‌یان کرد بو کوشتنی حضرتی عیسی تا خوا رفعی کرد بو آسمان ، وه له‌پاش رفعی عیسی اتباعی ئه‌و چه‌ند

انجیل‌یان دروست کرد تا له آخردا له‌سه‌ر چوار انجیل اتفاق‌یان کرد وه ئه‌م چوارانجلیشه مخالفی‌یه‌کن .

به‌لام امتی حضرتی محمد (ص) وه‌کو له حالی حیاتی ئه‌ودا قبولی زه‌حمت‌و هجره‌ت‌و نصره‌ت‌و جهادیان کرد هه‌روه‌ها قرآن‌و احادیثی مقدسه‌یان محافظه کرد وه له‌پاش وه‌فاتی ئه‌و زور به‌اخلاص

جمعیان کرده‌وه‌و نوسیانه‌وه وه هه‌رچی نسخه‌ی قرآنی شریف‌هه‌یه له عالم‌دا هه‌مو وه‌کویه‌کن وه ابدا له زیادو که‌می یك آیت‌دا به‌لکو له یك جمله‌دا

مخالفه‌یان نیه وه قرن به قرن آثاری علمای امت تا امرو ده‌وامی کردوه ٠

س٧٠ ـ خلفای حضرت (ص) چه ندن ؟

ج ـ خلفای حضرت (ص) پینجن ٠

س٧١ ـ خلیفه‌ی اول ناوی چییه وه نسبی چو نه ؟

ج ـ خلیفـــه‌ی اول ناوی عبدالله‌یه ، کنیــه‌ی ابو بکره ، لقبی صدیقه باوکی ناوی عثمانه ، کنیه‌ی ابو قحافه‌یـــه ، بابای ناوی عامره ٠ دایکی نـاوی سلمایه کچی صخری کورری عامره ، نسبی له‌گـه‌ل حضرت‌دا (ص) له جدی شه‌شه‌مدا (مره)ی ابنی کعب ئه‌بی به یه‌ك ٠

س٧٢ ـ خلیفه‌ی اول چون بو به خلیفه وه خلافت‌و عومری چه‌ند بو ؟

ج ـ له‌پاش وفاتی حضرت (ص) بـــه اجماعی صحابه ابو بکری صدیق بو به خلیفه وه دوســال‌و سه‌مانگ به عدالت‌و کفایتی خلافتی کرد ئه‌م جـار متوفی‌بو وه عومـــری شه‌ست‌وسه‌سال بووه لـــه حجره‌ی سعادت‌دا له پشتی حضرته‌وه دفن کرا ٠

س٧٣ ـ خلیفه‌ی اول له مده‌ی خلافتیدا چی کرد ؟

ج ـ ئه‌م ذاته رحمتی لی‌بی فرمانی زوری کرد : یه‌که‌م : لشکری (اسامه)ی کورری زید کـــه حضرت (ص) له حیاتی خوی‌دا حاضری کردبو ریکی

خستو رەوانەی کرد ٠

دوهەم چونکە زور لە اعرابی بدوی مرتد بوبونەوە وە قسمیکیان منعی زەکاتیان ئەکرد لەشکری بردە سەریانو مجبوری اطاعەی کردن ٠

سیهەم : لەشکری ناردەسەر مسیلمەی کذاب کە ادعای نبوەتی ئەکردو محوی کردوە ٠

چوارەم : لەبەر ئەوە لەمحربەدا ئەو اصحابانە کە حافظی قرآن بون زوریان لی شهید کرابون خلیفەی اول بە اتفاقی اعیانی ئەصحابە (زید)ی بن ثابتی حاضر کرد وە ئەو صحابییانە قرآنیان لەحفظدا بوو ، یا نوسیبویانەوە گردی کردنەوە وە بە کتابتی زید قرآنی بە تواوی نوسیەوە لە مدەی خلافتی خویدا لای خوی حفظی کرد لەپاش ئەو لەلای حضرتی عمر ، لەپاش ئەو لە لای سیدە (حفصە)ی حرمی حضرت (ص)مایەوە تا کەوتە زەمانی حضرتی عثمان ٠

پینجەم بە ریاسەتی خالدی کورری ولید لەشکریکی ریك خست بو عراق ٠ ئەوذاتە دو شاری فتح کرد : شاری حیرە ، شاری انبار ٠ شەشەم : لەشکری ریكخست بو فتحی شام ، وە امیری ئەملەشکرە ابوعبیدەی کورری جراح بو ٠ تا ئەم ذاتە گەیشتە شام وە بعضی جهادی کرد ، خلیفەی اول امری فەرموو بە خالدی کورری ولید لە عراقەوە

هات بو شـــام وه بو به امیری ئــه‌و له‌شــــکره ، وه به‌موافقه‌ی ابوعبیده دوشاریان فتح کرد : شاری (بصری)وه شاری (دمشق) • بعضی له مؤرخین ئه‌لین فتحی دمشق که‌وته روژی حضرتی عمر ( رضی الله عنــه ) • والحاصل ئه‌م‌ذاته بو محکم کردنی بناغه‌ی خلافتی اسلامیه‌ت زور اهتمامی کرد • خــوا جزای بداته‌وه به‌خیرو رحمت •

س٧٤ ـ خلیفــه‌ی دوهه‌م ناوی چییه وه نسبی چونــه ؟

ج ـ خلیفه‌ی دوهه‌م ناوی عمره ، لقبی فاروقه ، کنیه‌ی ابو حفصــــه • باوکی ناوی خطابــه باپیره‌ی ناوی نفیله • دایکی ناو حنتمه‌یه نسبی ئه‌م ذاتــــه له‌گه‌ل حضرت‌دا ئه‌بی به یك له جدی حه‌وتم‌دا کــــه (لوئی) کورری غالبه •

س٧٥ ـ ئه‌م ذاتــه چون بو بــــه خلیفه‌و مده‌ی خلافت‌و عومری چه‌ندبو ؟

ج ـ ئه‌م ذاته به امری خلیفه‌ی اول بو به خلیفه وه اجماعی صحابه له‌سه‌ری دامه‌زرا ، مده‌ی ده‌سال‌و سه‌مانگ خلافتی کرد ، عومری شه‌ست‌و سی‌ســال بو ، وه له حجره‌ی ســعاده‌ت‌دا لـــه خواری خلیفه‌ی اوله‌وه دفن کراوه •

س٧٦ ـ خلیفه‌ی دوهه‌م له مده‌ی خلافتی‌دا چی کــرد ؟

حضرتی یونس علیه السلام وفاتی کردو لـه عینی جیگەدا دفن کرا • مشهوروەهایە نبوتی حضـرتی یونس لە پاش سلطنتی اسکندری رومی وە لە ئەیامی ملوكالطوائفا بوە •

( بیداریی ) بعضی ئەهلی سیر ئەلین ئەو بحرە کە حضرتی یونس سواری کەشتی بو تیایا بحری روم بوە یەعنی بحری ابیضی متوســط • ئەمرأیە هەرچەندە ممکنە فقط عادتاً دورە وە ظاهر وایە یا نهری فرات یا دجلە بو بی بەلکو دجلە نزیك ترە وە ئەم دو نهرە لە عەهدی قدیمدا کەشتی هەوائی هاتوچوی پیاکردوە • والله اعلم •

**( درسی سی‌هەم بحثی حضرتی زکریا وە حضرتی یحیی علیهما السلام :**

حضرتی زکریا لە نسلی حضـرتی سلیمان بوە • باوکی ناوی ( یوحیا ) بوەو لە شــاما لەدایك بوەو خودای تعالی کردی بە پیغەمبەرو رەوانەی فــەرمو بو سەر بنی اســرائیل تا عمری کەیشــت بــە سەدو بیست‌سال اولادی نەبو • ئینجا تمنای کرد لە خودای تعالی کورریکی پی‌بدا ، خودا بە لطف‌و مرحمت تمناکەی قبول کردوە لە « ایشاع » ناوی عائلەی کــە پیرەژنیکی هەشتاسالە بو کورریکی پی‌عطا کــرد ناویان نا ( یحیی ) • ئەم‌ذاتە مقدســەیش هەر لــە حیاتی باوکیا خودا کردی بە پیغەمبەرو لەگەل باوکیا

مشغولی تبلیغاتی دین‌و تعلیم‌کردنی ( تورات ) بون له عصـری ئه‌مدوذاته‌دا پادشاییکی بنی‌اســرائیل عاشقی برازایکی خوی بوبو ئه‌ی‌ویست ماره‌ی بکا ،

ئه‌وانیش به حکمی شریعت منعیان ئه‌کردن ۰ له‌سه‌ر ئه‌م مسئله غضبییان گرت لی‌یان ۰ دایکی کچه‌کـه به‌حیله‌و سیاسه‌ت کاری‌کی کـرد پادشا حضـرتی

یحیی‌ی کوشت‌وه حضـــرتی زکریاش له ترســی ئه‌م‌پادشا ظالمه فراری کرد ، چونکه له هه‌مولایه‌که‌وه به‌دوایا ده‌گـه‌ران بـه ناچاری لـــه قرولی داریکا

خوی‌شارده‌وه ، که مأموره‌کان پی‌یان زانی داره‌که‌یان به‌مشارداهیناو حضرتی زکریایان له داره‌که‌دا کرد به دوپارچه‌وه ، به‌م‌غدره بی‌تامه ئه‌وذاته عالی صفاته له‌ناوبدا ۰ ئینجا مقابل به‌م جسارت‌و قساوته خودای

تعـــالی غضبی‌لی‌گرتن وه پادشاییکی آگرپه‌رستی به‌سه‌ریانا مسلط کردو ئه‌م‌پادشایه کوشت‌و اتباعی فوتان‌و سه‌دو حه‌فتا هه‌زار که‌سی به دیلی بردن ۰

**( درسی سی‌ویکه‌م ) بحثی حضرتی عیسی علیـه السـلام :**

ئـه‌مذاته صـــاحب همته کورری (مریم)ی کچی عمران له نسلی حضـــرتی هارونی برای حضـــرتی موسابوه ، به‌ینیان تقریباً هه‌زار سال بوه ۰ دایکی حضرتی مریم ( حنه ) خوشکی ( ایشاعی ) عائلـه‌ی حضرتی زکریایه ۰ ( حنه ) حامله بو وه زور مشتاقی

اولادبو ، لەبەر ئەمە نذری کرد لەسەر خوی ئەگەر خودای تعالی کورریکی پی‌بدا بیکا بە خزمەت‌کاری بیت المقدس • کە وضعی حملی بو قضـــاءً کچ بو ، ئەویش زور متاسفانە غمی خوارد وە ناوی نا بـە ( مریم ) دیسان لە سەر میلی خوی قراری‌دا بیکا بـە خادمـــەی ( بیت المقدس ) بـە تقدیری خودای تعالی هیشتا مریم مندال بو باوكو دایکی وفاتیان کرد • ئینجامقدسین بیت المقدس بو کفالتو بەخیوکردنی مریم قورعەیان خست نتیجەقورعە بەناوی حضـرتی زکریاوە دەرچو ، لەبەر ئەمە وە بە واسطەی ئەوەوە کە پوری مریم ایشاع‌ناو عائلەی حضـرتی زکریابو حضـــرتی زکریا بو بـــەکفیلی مریـم ، موقعی‌کی خصوصی‌یان بوتعیین کرد تا تیایا دابنیشی هەر لـە زەمانی مندالی‌یا چەند کراماتی لی‌دەرکەوت ، چـەند دفعە زکریا تەماشای حجرەکەی ئەکرد طعامو میوەی لەزیزی ئەبینی ، کە لی‌ی ئەپرسی ئەمەت لەکوی‌بوە ؟ ئەی‌ووت : خودای تعـــالی بـوی ناردووم • واقعـاً لەغیبەوە رزقی بو ئەهات • کە گەورەبو دەستی کرد بە خزمەت‌کردنی بیت‌المقدس • روژی بو ایشی خوی رویشتبوە خەلوەتیکەوە حضرتی جبرئیل علیه السلام بەئەمری خودای تعالی لە صورتی انسانیکا خوی بـە حضـــرتی مریم نشاندا • کە حضـــرتی مریـــم چاوی‌پی‌کـــەوت متأثرانـــە استعاذەی کردو زور

لەنظریا دشوارو نامناسب بو انسانیکی بیگانە لە خلوتیکی وەهـادا خوی پی نشان بدا . لە اثری استعاذەو تأثرەکەی مریمەوە حضرتی جبرئیل هاتەقسە وە فەرموی : من مأمورم لە لایەنی خودای

تعالی بو ئەمە کورریکی جوانو صاحب‌مقامت بدەمی ، مریم فەرموی عجبا چون قابلە من اولادم ببیت والحال شوم نەکردرە ؟ جبرئیل فەرموی تقدیری خودا وەهایە وە خودا لەسەر هەموشتی‌کا قدرتی هەیە ،

لەووەختا فوی‌کرد بە حضرتی مریما فوراً بەوفوە حاملەبو ، وە وەختی وضعی حملی‌هاتو ژانەسک گرتی مریم بە ئەسفو تأثیریکی فوق العادەوە لە

بیت المقدس دەرچو بو ناو باغی کە لەونزیکانەدا بو وە رویشتنەژیر سیبری دارخورمایك وە لەویا حضرتی عیسی تولدی بو .

ئەمژنە عفیفە لە وضعی خوی زور محجوب بو وتی خوزگایە من هەر نەبومایە یا خود بەرلەمحالە بمردمایە ، ایستە من چی‌بکەم وەکی برروام پی‌ئەکا

کە ئەم مندالە فقط بە قدرتی خودای تعالی بی‌واسطەی باوك پەیدا بوە . لەمقسە وغەمەدا بو حضرتی عیسی لەژیرداوینەیا بانگی لی‌کردو عەرضی کرد : دایە هیچ

عاجزو متأثر مەبە جاری ئەو لقە دارخورمایە راکیشە بولای خوت ایستە خورمای پی‌ئەگاتو دائەکەوی بەسەرتا وە لەبەر دەمیشتا کانی‌کی خوش

پەیدائـەبی ، خورمابخو وە آوی شیرین بخورەوە وە هەرکەسی پرسی ئەم مندالەچییە تی‌ی‌بگەیینە کـــە بەروژوم لەسەرخوم نذر کردوە قسە ناکەم ، چونکە لەوزەمانەدا هەرکەسی روژوی نذر بکردایە تا نهایتی روژوەکەی قسەیشی نەئەکرد ·

حضرتی مریم لقە دارخورماکەی راکیشـا فورا خورمای گرت وە داباری بەسەریا وە آویش لەلای پەیدا بو ، بە چاوپی‌کەوتنی ئەم وضعە مقداری حالی اهون بوەوە·لە پاش ئەمە عیسای هەل‌گرت‌و هاتەوە بو ناو قومەکەی ، کە قومەکەی عیسایان بینی زور بەاستنکارەوە پرسی‌یان‌لی‌ی ووتیان ئەی مریم ئـەم مندالە چییە ، وە ئەمە چە وضعیکە خو تو نە باوکت‌و نە دایکت اخلاقی خراپیان نەبوە ؟ ئەویش اشارەتی کرد بو عیسی : کە لەم کوررە بپرسن ، ئەوانیش بە تعجبەوە ووتیان چون قسە ئەکریت لەگەل مندالی کی وەهادا · لەم‌اثنایەدا عیسی علیە السلام هاتەقسەو ( فەرموی من عبدی خودام وە خوا بە فضلی خـــوی کتیبـی پی‌داووم وە کردومی بـە پیغەمبەر وە لـــە هەرجیگایی ببم بە برکتم وە باعثی برکتی ئـــەو جیگایەم وە خودای تعالی ئەمری پی‌کردووم بە نویژو زەکات تازیندو بم لە ارضاو کردومی بە انسانیکی چاك‌و اخلاقم لەگەل دایکم چاکە ) · کە ئەم قسانەی فەرمو قەومەکە بون بەدو فرقە بعضیکیان باوەرریان

کرد بەمە کە عیسی بە محضی قدرتو ایجادی خـودا وە بی واسـطەی باووك پـەیدا بوە وە پیغەمبەری خودایە ، وە مریم لەهەموو تومەتی مەحفووظە ٠ بعضیکیشیان انکاریان کرد وە لە حقیقتو انصافو عقل لایاندا ٠

حضرتی عیسی گەورە بو خودای تعالی ( انجیل )ی بو رەوانە فەرمو ، ئەویش دەستی کرد بە تبلیغاتی احکامو اموراتی دین ، وە بو اثباتی نبوتی لە نظری عالەما خودای تعالی چەند معجزەی گـەورەی پیدا :

مردوی زیندو ئەکردەوە ٠ کویرو کەچەلو بەلەکی خوش ئـەکردەوە ٠ وە دوازدە کەس لە خواصـی اصحابی بون کە مشهورن بە (حواری) یەعنی رفیقی خالصن ، ئەمجماعتە لەسەر دستوراتی حضـرتی عیسی مشغولی تبلیغاتی دینی عیسی بون ٠

بەرامبـەر بەم هەمو معجزاتو برکاتە ظاهرە یهود لەسـەر قاعدەو اصـولە عادیەکەی خویان دەستیان کـرد بە افسـادو اخلالو عنادو انکارو مکابرەیان لەگەل عیسـیو اتباعەکەیا ئـەکردو

بەدەستیاری حکومتەکەیان بەرهەلستی نشرو رواجی دینی حضرتی عیسیyan کردو ، لە نتیجەدا اتفاقیان کرد بیکوژن ، دەکەسیان هـاتن عیسایان گرتو ، ویستیان بیبەن بیکەن بەدارا خودای تعالی حضرتی عیسای لە ناویانا لابردو بردی بو آسمانو صورتو سیمای عیسای خستە سەر یەکی لەو دەکەسـەو

ئەوشخصەیان بردو کوشتیان ، لە عاقبتا کە رفیقەکەی خویان دیار نەبو تأملیان کرد لە کوژراوەکە حالی بون ئەم کوژراوە رفیقەکەی خویانەو عیسی نی یە ، بەلام تازە چی بکەن عیسی لە آرادا نەماوەو نازانن چی لی هاتوە • موافقی ظاهری آیت خودای تعالی عیسای بردوە بو آسمان ، وە موافقی حدیثی صحیح لە آخری زەمانا لە آسمان دیتە خوارەوە بو سەرزەوی و مدتی لەشاما اقامت ئەکاو لەسەر نهجی شریعتی اسلامی رفتارو معاملە ئەکات و لە مدینەی منورەدا متوفی ئەبیت •

لە پاش رفعی حضرتی عیسی یهود کەوتنە هەولی لەناوبردنی آثاری دینەکەی وە اصولی دینەکەی نەما، وە هەندی لە اتباعەکەی لەبەر تضیق و اذیتدانیان بلاوبونەوە • مشهورە دیی (هورین) لە ناحیەی میدان تابعی قضای خانقین بە ناوی ( حوارییں ) ناوبراوە وە لە زمانی کوردیدا بوە بە ( هورین ) حتی لە بعضی ئەهلی کشف لەعهدی حضرتی شیخ المشائخ عمر ضیاءالدین قدس سره بیسراوە کە لەوحوارییەی لەو موقعەدا بە (مکاشفە) بینیوە •

لە پاش رفعی عیسی علیه السلام لە اثری افسادات و اخلالاتی یهودا انجیلی صحیح لەسەر زەویا نەماوە ، دەستی تحریف و تبدیل برایە توراتیشەوە ، روژبەروژ دنیا بە تاریکی جهل و وحشت و آدابی

غیرەشروعە داگیر ئەکرا بە نوعی لە هەمو نقطەییکی جزیرة العربا بتپرستیو دینو آیینی خرافیە دائر بو وە ئەموضعە تقریباً پینجسەدساڵو کسور دوامی کرد • ئینجا دنیا زور محتاج بو بە آفتابیکی عالمتابو چرایکی شعلەوەر کە هەمو گوشەییکی دنیا

روناك بکا تەوە ، بەم مناسبەوە خودای تعالی روژی طلعتو سیمای باصفای حضرتی ( محمد المصطفی )ی ـ صلی الله علیه وسلم ـ لە افقی شرقیوە لە دنیا آشکرا کرد •

## ( درسی سیودوهەم ) حضرتی محمد المصطفی ـ صلی الله علیه وسلم ـ لە پیش نبوتا :

ئەمذاتە عالیدرجاتە ، وە ئەمسەروەرە سەرئەفرازە ، وە ئەمشافعی روژی نیازە ناوی مبارکی محمد (ص) کورری عبداللهیە • عبدالله کورری عبدالمطلبە ، عبدالمطلب کورری هاشمە ، هاشم کورری عبدالمنافە ، دایکی ناوی آمینەیە ، آمینە کچی وهبە ، وهب کورری عبدمنافە ، عبدمناف کورری زهریە •

اجدادی ئەمذاتە لە عەربی حجازو لە طائفەی قریشو لە نسلی قیداری کورری حضرتی اسماعیلن • ئەم سلسلە عالیە لە آدمەوە تا خاتم هەمو خودا پەرستبوون • وە « آزەر » باوکی حضرتی ابراهیم نەبو بەلکو مامی بوە فقط چونکی بە مندالی حضرتی ابراهیم لەلای ئەو بوە پییووتوە بابە •

حضرتی فخری عالم (ص) پینجسەدو حەفتا سال لـە پاش میلادی عیسی لە وەرزی بـەهارا لە روژی بیستەمی نیســانی رومی لـە وەختی طلوعی فجرا ریکەوتی دوازدهەمی ربیع‌الاول لە روژی دوشەنبەدا تولدی‌بوه ·

خودای تعالی بە لطفی خوی بو دامەزراننی بناغەی شرافتی ئەو لە شەوی تولدی ئەوا چەند فەرمانیکی گەورەو علاماتیکی بەقیمتی نشانی ئەهلی عالم‌دا · ایوانی سلطنتی کسرای لەت کـرد ، چوارده طاقی داکەوت ، آگری مجوسیت کە هەزار سال بو لە خاکی فارس‌دا ئەگررا کوژانیەوە ، وە آوی بحری طبریــە روچو ووشك‌بو · ئەم‌ذاتە دومانگ لە پیش تولدیا باوکی لە سفری تجارەتا متوفی بو ، ئینجا کە تولدی بو اول کەسی کە شـــیری پیداوە بیجگە لـە والدەی ثویبەی جاریەی ابو لهب بو · لەپاش مدتی (حلیمە)ی سعدیە هات بو مکەی مکرمە وە بە صورتی دایەنی وەری گرت‌و بردی بوقبیلەی (بنی سعد) تا نهایتی مدتی شیرخواردن شیری پیدا ئینجا هاوردیانەوە بو مکە بو مالی (عبدالمطلب)ی باپیرەی ، وە لە عمری شەش‌سالی‌دا لەگەل والدەی مطهرەی آمینە رویشت بو مدینەی منورە بو دیدەنی خالەکانی، کەلەوسەرەوە هاتنەوەو گەیشتنە (أبواء) ، والدەی نەخوش کەوت‌و وفاتی کرد · وە لـە عمری هەشت‌سالی‌دا بو کـــە عبدالمطلبی باپیریشی وفاتی کرد ، وە لەسەر وصیتی

ئەو لەلای مامی کە (أبو طالب)ە دانیشت · لە عمری دوانزە سالی‌یا لەگەل ابو طالبی مامی رویشت بو مملکتی شام · کە گەیشتنە شاری (بصری) لەسەر اشارەی (بحیرای) راهب گەررانەوە بو مکە · وە لە عمری هەژدە سالی‌دا لەگەل (زبیر)ی مامی سفری کرد بو مملکتی یەمەن‌و هاتەوە · لە عمری بیست‌وچوار سالی‌یا بو بە وکیلی (خدیجە)و رویشت بو مملکتی شام بو تجارت ، کە گەیشتە بصری لەسەر اشارەی (نسطورا)ی راهب هەر لە بصرادا معاملەی کردو گەررایەوە بو مکە · ئینجا (خدیجە)ی کچی خویلد کە لە اشرافی مکە بو نکاحی کرد وە لەسەر حالەتی عزت‌و رفاەو شرف پیکەوە رایان ئەبوارد ·

**(درەسی سی‌و‌سی‌یەم) بحثی حضرتی فخری عالم (ص) لە أول أوضاعی نبوتی‌یەوە تا وەختی هجرت ، یەعنی رویشتنی لە مکەوە بو مدینە زادهما الله شرفاً ·**

ئەهلی سیرت‌و تواریخی اسلامی ئەلین : حضرت (ص) لە عمری سی‌و پینج سالی‌یا میلی خلوت‌و عبادت‌و طاعەتی پەیدا کرد ، وە لەم تاریخەوە لە هەمو سالیکا مانگی ئەررویشتە غاری حراء وە بو دوزینەوەی صانعیکی صاحب قدرت‌و عظمت تفکری ئەکردەوە ، ئەیزانی کە وضعی بت‌پەرستی خرافات‌و جهالتە ، وە ئەیویست کە بەشەر لەم‌تاریکی وحشتە نەجات بدا · کە سالی (چل) هاتە پیشەوە علامات‌و

نشانەی نبوتی دەرکەوت وە انشراحی دڵرو ناکیکی فوق‌العادەی بو پەیدا بو ، حتی شەش مانگ لە پیش تەواو بونی ئەم سالا هـــەر خەویکی ئەبینی وەکو روشنایی روژ ئەهاتەدی ٠ لە ســـەری چل سالەدا روژی لە غاری (حراء) دا بە رسمی سابقی دانیشتبو کوتوپرر حضــرتی جبرئیلی ئــەمین علیه السلام کــە ملائکەیکە لەچوار ملائکە مقربەکان وە ئەمینی وحی بوە لە طرفی ذاتی خودای تعالی‌وە بو لای پیغەمبەران علیهم السلام ، بە ئەمری خوادای تعالی هات بولای حضرت (ص) وە چـــەند ئایەتی لە قرآن بەســەرا خویندەوە ، لەم تاریخەوە تا سی‌سال وحی بو نەهات، لە سالی چل‌و سی‌دا روژی لە غاری حراوە ئەهاتەوە بو مکە لە ریگەدا بو دەنگی حضرتی جبرئیلی بیست وە خوی پی‌نشان‌دا ٠ لە دوای ئەمە پەی‌دەرپەی آیتی بو ئەهاورد وە ئەمری پی‌کرا کە هەمو بەشەر بانگ بکا بو توحیدو خواناسین ٠ یەکەیەکەو دودو ئەهلی مکەو اطراف ئەهاتن ایمانیان ئەهیناو موسولمان ئەبون ٠ طبقەی اول لەوانە کە مسلمان بون حضرتی ابو بکری صدیق ، حضرتی علی ، زیدی کورری حارثە ، بلالی حەبەشی ، خدیجەی عائلەی ، ام الفضل حرەمی حضرتی عباس‌و اسمای کچی حضرتی ابوبکر بون ٠

طبقەی دوهەم حضــرتی عثمان‌و زبیری کورری عوام‌و عبدالرحمانی کورری عوف‌و سعدی کورری ئەبی وقاص‌و طلحــەی کورری عبدالله‌و ابوعبیدەی

کــوڕری جــراح‌و ابو ســـلمه‌و ارقمی مخزومی‌و عثمانی کوڕری مظعون له‌گـــه‌ل دوبرایا عبدالله وه قدامه ، وه عبیده‌ی کوڕری حارث وه سعیدی کوڕری زید ، وه فاطمه‌ی کچی خطاب‌و حضرتی عمری کوڕری خطاب بون • له‌پاش مسلمان بوونی حضــرتی عمری کوڕری‌خطاب (ض) ئینجا ده‌نگی اسلامیت به مکه‌و اطرافا شهرتی وه‌رگرت‌و عه‌ربه مشرکه‌کان ده‌ستیان کرد به اذیت‌دانی اصحابه کانی پیغه‌مبه‌ر (ص) له‌به‌ر ئه‌مه حضرت (ص) ئه‌مری پی‌فه‌رمون برون بو مملکتی حبشه بو لای (نجاشی) پاشای حبشستان • قســـمی اعظمیـــان هجرتیان کردو رویشـــتن بو حبشـه ، وه له‌واقعا (نجاشی) زور به‌شرافت وه جوانمه‌ردی جیگای پی‌دان‌و اکرام‌و حرمتی گرتن • ئه‌مه أول هه‌نگاو بو له شهرت‌ســاندنی اسلامیت لــه خاکی خارجه‌دا • مشرکه‌کان زور متأثرو ناره‌حت بون ، له‌ناو خویانا قراریان‌دا مادام ابوطالب کومه‌ك‌و یارمه‌تی حضــرت بدا هه‌مو به‌جاری ته‌رکی معامله‌و تجارت‌و دوستیی طائفه‌ی بنی‌هاشم‌و بنی مطلب بکه‌ن • ئینجا له‌بــه‌ر ئه‌مه ابو طالب به‌راستی نصرت‌و مساعده‌ی حضرتی ئه‌کرد ، مشرکه‌کان قراره‌که‌ی خویان دابه‌ست وه بنو هاشم وه بنو مطلب به مجبوری له شاری مکه ده‌رچون وه لــه جیگایــه له‌ونزیکا که مشـــهوره به (شعبی عبدالمطلب) مانه‌وه تا سی‌سال ئه‌م مقاطعه‌یه دوامی کرد ، ئینجا بعضی له اصلاح‌خواهانی عه‌ره‌ب که‌وتنه

بینەوەو ئەم دوطائفەیانە هیناو بو شاری مکە ، کە هاتنەوە مکە لەم تأریخا کە نوسال لە نبوت رائەبورد سورەتی (والنجم) نازل بو ، کە حضرتی فخری عالم (ص) ئەم سورەتەی خویندەوە بەسەر عەرەبەکاناو ،

گەیشتنە آیتی سجدە لە آخریەوە هەمویان لە هیبتی ئەوآیەتە سجدەیان برد ، مهاجرەکانی حبشە ئەمحادثەیانە بیست وا حالی بون کە مکەیی مسلمان بوون لەبەر اشتیاقی وطن هەمو هاتنەوە بو مکە ٠

کە گەیشتنە بەرەوەوە وضعیتیان چاك نەبینی تکرار رویشتنەوە بو حبشە ٠ لەپاش ئەمە کە سالیدەهەم هاتە پیشەوە أبوطالب وفاتی کردو سیروژ لە پاش ئەو حضرتی خدیجەش وفاتی کرد ٠ حضرت (ص) لەم

اوضاعە زور متأثر بو ، وە تشریفی رویشت بو شاری طائف ، مدتی مانگی لە طائفا دعوتی ئەو ملتەی ئەکرد بو اسلامیت قبولیان نەکرد ٠ ئینجا تشریفی لە طائف دەرچو بو مکە ٠ کە لە طائف هاتە دەرەوە حضرتی جبرائیل نازل بو وە عرضی کرد خودای تعالی سلامت لیئەکا وە ئەمری فەرموە کە من مطیعی تو بم ئەگەر ئەفەرموی با شاری طائف ویران بکەم ، حضرت (ص) فەرموی نەخیر رازی نیم چونکی ئەم قومە بی معرفت وە نەزانن بەلکو لە نسلی ئەمانە انسانی بە معرفتو عاقل پەیدابی ٠ کە حضرت (ص) تشریفی گەیشتەوە مکە رویشتە پەنای (مطعمی کورری عدی) کە واقعا ئینسانیکی بەغیرتو شرافت بو ٠

## (درسی سی‌ی‌وچوارەم) بحثی هجرت کردنی حضرت (ص) لە مکەوە بومەدینە :

لەپاش وفاتی ابوطالب‌و خدیجەی عائلەی کەوتە سەر فکری دەرچون لە مکە • ئینجا هەمو سالی لە وەختی حج‌دا کە قبایلی عەرەب ئەهاتن بو طوافی (کعبة‌الله) حضرت ئەررویشتە ناویان وە دعوتی ئەکردن بو مسلمان بون وە داوای نصرت‌و مساعدەو جیگەی اقامتی لی‌ئەکردن • لەسالی پەنجاویک‌دا تشریفی رویشت بو ناو حجاجی مدینەیی ، حەوت کەسیان مسلمان بون •

هەر لەم‌سالەدا لە بیست‌و حەوتی مانگی رجبا خودای تعالی سەربەرزی کرد بە رتبەی (معراج) • بە نەصصی آیت‌ثابتە کە لە شەویکا لە مکەوە گەیاندیە مسجدالاقصی کە عیبارەتە لە بیت‌المقدس لە شاری (قدس) • وە بە حدیثی صحیح ثابتە کە لە بیت المقدسەوە لە عینی شەوا بەجسم‌و جسدی مبارکی عروجی پی‌کرا بو ژوری هەمو آسمانەکان‌و خطاب‌و کلامی ذاتی خودای تعالی‌ی بیست‌و پینج فرضەی نویژی لەسەر خوی‌و امتی واجب کرد • هەر لەوشەوەدا تشریفی هاتەوە بو مکەی مکرمە • لە سالی پەنجاو دودا لە موسمی حج رویشتەوە بو ناو حجاجی مدینە • پینج کەسی تر لەگەل حەوت شخصەکەی سالی پیشو هاتن ایمانیان هینا • وە لە سالی پەنجاو سی‌دا لە موسمی حجا جماعتیکی زور لە

مدینەیی هاتن ایمانیان هینا وه وعدەی نصـــرتو
کومك یان دا به حضرت (ص) وه رجایان لی کرد کــه
تشریفی بروا بو مدینه ، که ئەم جماعته گەررانەوه
بو مدینه اســــلامیت له مدینــــەو اطرافی مدینەدا
بلاوبوەوەو رغبتیکی زوریان پەیدا کرد له قبولکردنی
دینی اسلام ٠ که کافرانی مکه لەم وضـــعه خبردار
بون کەوتنه خطرەوه له قوتی حضرت(ص)وه قراریان
هاته سەر تدبیری مدافعەی ئـەمذاته وه لەشــــەوا
رویشتن بو مالی حضرت (ص) بەقصدی کوشتنی ،
حضرتی جبرئیل به ئەمری خودای تعالی زو خبری دا
به حضرت (ص) ئەویش تشریفی لەمال هاته دەرەوه ،
ملاحظەی فــــەرمو جماعتی وان لەدرگای مالەکــەدا
ئەویش اولی سورتی (یسن)ی خویند به مشتی خولا
وه وەشانی به رویانا به قدرتی خودای تعالی هـــەمو
بەرچاویان تاریك بو تا حضرت (ص) لەوآرادا دەرچو
وه رویشـــــت بو مالی (ابو بکری صـــــدیق) خودای
لی راضی بی ٠ ئینجا پیکەوه هەستان لەمکه چونــه
دەرەوەو تشریفیان برده (غاری ثور) خویان پەنادا ٠
جا که کافرەکان رویشتنه مالەوه گەرران حضرتیان
نەبینی بەنائومیدی هاتنەدەرەوه وه کەوتنه تعقیباتەوه
به هەمو لاییکا حتی له شار دەرچون وه رویان کرده
غارەکه لەویا ابوبکری صدیق خەوفی پیدا کرد که
کافرەکان بیان دوزنەوه ، حضرت (ص) فەرموی هیچ
مەترســـه خودای تعـــالی لەگەلمانــــه ئەمانپاریزی ،

لەم‌وەختــا بو محافظـــە ئەم‌ذاتانە خــودای تعــالی (عنکبوت) جولایی کەرەی نارد درگای غارەکەی تەنی وە کوتریکیشی نارد لە درکای غارەکەدا هیلانــەی کــرد ، کــە کافران هاتنـــە لای دەرگای غارەکــە ئـــەم‌وضعەیان چاوپی کـــەوت مأیوس بــون وە

گەررانەوە • خولاسە لە پاش سی‌روژ حضــرت (ص) لەگەل ابوبکری صدیقا کەوتنە ریگە بو مدینـــەی منورە • کافرەکانی مکە چونکە ئەیان‌زانی کە حضرت (ص) ئەروا بو مدینە وعدەی سی‌وشتریان دا بـــە (سراقەی بن مالك) بروا لــــە ریگادا بیان‌گریت •

ئـــەویش رویشت بە شــوینیانا کە نزیکیان بووە هەررەشەی لی‌کردن • حضــرت (ص) لای‌لی‌کردەوە بەخویو وشترەکەیەوە رویشتنە خوارەوە بەزەوی‌یا ، سراقە کــە ئەمەی بەســـەراهات زور پاررایەوە تا ئەجاتی بو ، تکرار خەیالی کرد ئەم روچونە لەبـــەر زوری‌رملی موقعەکەیەو تەکانی‌دا بروا بیان گریت

دوبارە حضرت (ص) لای‌لی‌کردەوە وەکو جاری پیشو خویو وشترەکە روچونەوە بەزەوی‌یا • دیسان سراقە پاررایەوە تا نـــەجاتی بو ، دیسان‌هەلەتی بردەوە حضرتیش (ص) لای‌لی کردەوەوە رویشتنەوەخوارەوە بەزەوی‌یا ئینجا حضرت (ص) فەرموی ئەی‌ســراقە خیالی عبث مکەوە ایمان بهینە مژدەبیت امتی من غلبە ئەکــەن‌و تاج‌و لباسی کسری لە غەنیمەت‌دا ئەگرن‌و ئەدریت بەتو • ئینجا سراقە قناعتی کردو گەررایەوە

بو مکـــەو معـــذرتی کردو وتی‌پی‌یان نەگەیشتم ٠ حضرت (ص) لەگەل ابوبکری صـــدیقا رویشتن تا گەیشتن بە (قباء) کە شوینیکە لە نزیکی مدینەی منورە ، لەوی دانیشتن‌و بیست‌ودو روژ اقامت‌یان کرد جا تشریفی ریکەوت بو شاری مدینەو طائفەی (أوس‌وخزرج) پیشـــوازیەکی زور بەشـــەرف‌و اهمیت‌یان لی‌کرد وە لە خزمەت‌یا واردی مدینـــەی منورە بـــون ٠ حضـــرت (ص) لـــە مالی ابوأیوبی انصاری‌دا دابەزی وە لەوی سکونەتی کرد ٠ لەپاش حەوت مانگ عەرەسەییکی کرری مزگەوتیکی عالی‌و چەند هودە خانـــوی تیاکردەوە ٠ ئـــەمجار ناردی بەشوین عائلـــەی خوی‌و حضـــرتی ابوبکرا هاتن بو مدینەی منورە ٠ ئینجا اصحابەکانیش کە لە مکەوە هجرت‌یان کرد بو بو مملکتی حبشە هەمو هاتن بو مدینە وە بە شادی‌و فرح کەوتنە ترتیباتی تبلیغی دینی پیروزی اسلام ٠ انصاری مدینە زور معاونت‌و مساعدەیان بە مهاجرەکان نشاندا ، حتی ئەگـــەر حضـــرت (ص) منعی نەکردنایە ئەیان‌ویســـت ژنی خویان طلاق بدەن بو ئەمە مهاجرە بی‌ژنەکان نکاح‌یان بکەن وە بە اتفاق‌و برایەتیکی راست حاضـــربون بو خزمەت‌کردنی حضرت (ص) ٠ وە دەستیان‌کرد بە جهادو محاربەکردن لەگەل دوژمنانی اسلامدا، با براو خزمی خوشیان بونایە ٠ بە یـــەك دلی‌و اخلاص لـــە مدتیکی کەما زور پیشکەوتن وە لە مدتی دەسالا کە

حضرت (ص) له مدینـــەدا مایەوەو بەرحیات بوە ، بیستوحەوت حەربی بەاهمیت‌یان لەگـەل کافرانا کرد • له «نو»حرب‌یانا حضرت (ص) • نفسی مقدسی خوی حاضر بو •

مهم‌ترینی ئەم حربانه حەربی (بدر)و (حنین) بوو • خاکی حجازو یەمەنیان بەتەواوی فتح‌کرد • له سالی هەشتی هجری‌دا شاری مکەی مکرمەی فتح کـرد • وە له سالی دەهەمی هجری لەگەل سەدوچوار هەزار کەس له اصحابی کرام (ض) تشریفی رویشت حجی کعبة اللّه‌ی کرد • که لەم سفرە گەررایەوە له ریگەدا زوروعظو نصیحتی دینی‌و اجتماعی بو فەرمون ، له پاش ئەم سفری حجه که مشهورە بە (حجة الوداع) بەمدتی سی‌مانگ له دوازدەی ربیع‌الاولا وەفاتی کرد. وە له حجرەی حضرتی عایشــەدا دفن کرا ، عمری مبارکی شەستو سی سال بو •

ئەم‌ذاته عالیه له عصری خویا هەمو تبلیغاتیکی فەرمو وە قرآنی شریف که خـودای تعالی لـە مدەی بیستوسی‌سالدا بە واسطەی جبرئیلی امینەوە بوی رەوانه کردو عبارته له شەش هەزارو شەش‌سەدو شەستو شەش آیت لەگـــەل سنتی قولی‌و عملی‌و

تقریری‌دا یـــەعنی فەرمایشاتی مبارکی ، یا ئـــەو رەفتارو کردارە که بالذات خوی کردویەتی وە یا خود کەســـی فەرمان‌و رەفتاری یا قسـەییکی کردبی وە حضـرت (ص) آگادار بوبی وە بـــەبی مانع انکاری

نەفەرموبی • ئەم مجموعەی بەجی هیشــت بو أمتی
کە رەفتاری پی‌بکەن • وە لە وەختی وفاتیا ســەدو
چوارده هەزار کەس لە اصحابی کرام موجود بوون
وە چوارده هەزار کـــەس نویژی جنازەی مقدس‌یان
کردوه • ئـــەم اصحابانە کە خودای تعالی اختیاری
فەرمون بو رەفاقەتی خوشەویستی خوی لـە دوای

انبیای کرام لە هەمو کەس چاكتر بوون وە خودای
تعالی لە قرآنا زور مدحو ثنای فەرموون، بە چاکترینی
امتی پیغەمبەرانی داناونو بە امتی وســطو عدلی
ژماردون ، وە بە آمر بـە چاکەو ناهی لـــە خراپەی
تعــریف کردون وە فەرمویەتی ئـەم قومــە خوفو
مبالات‌یان نی‌یە بە لومەی هیچ‌کەس لە خصوصــی

اطاعــەی خودای تعالی ، وە لەبینی خویانا نــەرمو
بەرحمو شفقتن ، وە لە سەر دوژمنانی دین بەقوتو
هیبتو شدتن ، مژدەی داوە کە ئەم قومە لە خودای
خویان رازین وە خودا لەوان رازیە •

ئینجا ملاحظە بکەن گروهی خودا وەها تعریف‌یان
بکاتو تأریخی صـــحیحی اســـلامو غیره مناقبو
مفاخریان نقل بکات • معلومە اصولو فروعی دینــی
خویان باش محافظە ئەکـــەن وە لە اعمــالو اخلاقو
رەفتارا صاحب امتیازی فوق العادەن ، کەوابو لازمە
هەمو مسلمانی بە ادبو احترام تەماشایان بکات وە
لە وەختی ناوبردنیانا داوای رضاو رحمتی خودای
تعالی‌یان بو بکـــات • رضـــوان الله علیهم وعلینا

ببركاتهم اجمعين ٠

**(دەرسی سی‌ی‌و پینجەم) بحثی خلیفەی‌اول لە چوار خلیفەی حضرت (ص) ورضي الله عنهم ٠ (ابو بكری صدیق) (ر ض) :**

ئەم‌ذاتە پاك‌مشـرب عالی‌حسبە ناوی عبدالله‌یە ، كنیەی ابوبكرە ، لقبی صدیقە ، باوكی ناوی عثمانە ، كنیەی ابوقحافەیە ، دایكی ناوی سلمی‌یە كنیـــەی ام الخیرە لە عـەربی مكە وە لە طائفەی حضــرتی فخری‌عالم (ص) ٠ لە باپیرەی شەشەما كە (مرە)ی كوړری كعبە ئەگات بە حضرت (ص) ٠ ئەم‌ذاتـــە اول‌كسیك بو تصدیق‌و باوەری كرد وە ایمانی هینا بە حضـرت (ص) وە قطعا لــە آدابی زەمانی جاهلیتا متاثر نەبوە و خوی پیوە نەگرتوە ٠

حیات‌و مال‌و جاهی خوی لە ریگەی اســـلامیتا صرف كردوە ٠ حضرت (ص) لــە نەخوشینی وفاتیا كردی بە امام بو اصحابەو هەمو لە پشتیەوە نویژیان ئەكرد حتی روژی حضــرت بعضـی افاقەی بوبو ، تشــریفی لە وەختی نویژا رویشـــت بو مزگەوت لەووەختا حضرتی ابوبكر حسی كرد بە هاتنی ویستی بیتە دواوە ٠ حضرت (ص) اشارەی فەرمو بەمە كــە لەسەر وظیفەی خوی دوام‌بكات ٠ كە حضرت متوفی بو بەر لە دفن‌كردن هەمو اصحابەی كرام مهاجرین‌و انصار لە ساباتی طائفەی بنی ساعدەدا گرد بونەوە بو دانانی خلیفە وە بە اتفاقی هەمولایە بیعتیان كرد

به ابو بکری صدیق (ض) ٠ له پاش ئەمە ابو بکر تشریفی هەســـتا خطبـەییکی خویندەوە ، منهجی رەفتاری خۆی پی نشان‌دان ٠ خولاسەی مضمونەکەی دو نقطەی جوهری بو ٠ نقطەی اول تشجیعی اصحاب لەسەر خوداپەرستی وە قوت‌و دیانت ، نقطەی دوهەم ئەمە بو کە من خوم لە ایوە بەچاکتر نازانم وە ایستە ایوە منتان‌کردوە بە گەورەی خۆتان کەوایە دائمـاً ملاحظە بکـــەن ئەگەر ایشـــی چاکم کرد معاونت‌و مساعدەم بکەن ، ئەگەر ایشـــی خرابم کرد ارشـادم بکـەن وە بم‌گیرنەوە بو ســـەر منهجی استقامت ٠ بەم‌خطبەیە هیزو توانایەکی بەرزی خستە ناو ریزی موسولمانانەوە کە هەمو بەیەك‌دل‌و یەك روح بو بەرزی دینی مقدسی اســـلام بکوشـــن وە سعی‌بکەن پو پیش‌خستنی ٠

ئەم‌ذاتە عالیە (مع الاسف) دوســـال‌و سی‌مانگ لەدوای حضرت (ص) ژیا ، بەلام گەلی فەرمانی زور مهمی کرد ، ئەول : ئەوجیشە کە حضرت (ص) لـە حیاتی خـویا ریکی خســـت‌بو بو روم بـە ریاستی «اسامە»ی کورری زیدو لەبـــەر نەخوشین‌و وفاتی نەرویشـتبون ، ابوبکری صـــدیق ناردنی واقعـاً رویشتن‌و بەمنصـــوری گەررانەوە ٠ دوهـــەم : ئەواعرابە بدەوی‌یانە گە عصیان‌یان کرد وە حقوقی بیت المال‌یان نەئەدا تسخیری کردن وە مجبوری کردن بەاطاعت ٠

سى‌هه‌م : خالدى بن‌وليدى نارد بو سه‌ر طليحه‌ى اســدى وه بو ســـه‌ر «بنى تميم» تفرقه‌ى كردن . چوارەم لەشكرى كرد بو سه‌ر مسيلمه كذاب لـــه يمامه ، وه هه‌ر چه‌ند تبعه‌و قوميكى به‌قوت‌و شوكتى بو فوتاندنى ، له‌م حه‌ربا مسيلمه‌ى كذاب به ده‌ستى (وحشى) ناو كوژرا .

پينجـــه‌م : به مشورت كردن له‌گـــه‌ل عمر بن الخطاب‌و زيدى‌بن ثابت وه بعضـى له كبارى اصحابه قرآنى گردكرده‌وه عمومى له (جلدى مدبوغ) پيستى ده‌باغ‌كراو نوسينه‌وه چونكى وه‌ختى خوى له‌بـــه‌ر ته‌بونى اسباب بعضيكى له له‌وح وه بعضيكى له‌سه‌ر ايسكى ساف به‌م‌نوعه نوسرابوه‌وه ، وه معرّض بوو بو په‌ريشـــانى‌و فه‌وتان ئـه‌ويش حافظانى قرآن‌و كاتبانى زه‌مانى سعادتى احضار كرد ( على رؤوس الاشهاد ) هه‌موى نوسى‌يه‌وه ، بـه كتابتى زيدى بن ثابت كه عالميكى مهم وه كاتبيكى به كفايت‌و امانت بو له كاتبه‌كانى حضرت (ص) خودا جزايان بداتـه‌وه .

شه‌شـــــه‌م : خالـــدى بن‌وليدى نارد بو عـــراق (حيره‌وانبار)ى فه‌تح كرد . حه‌وته‌م له‌شكرى هه‌نارد بو يه‌مه‌ن بو سه‌ر (اسودعنسى) هه‌شته‌م له‌شـكرى نارد بو (بحرين) . نوهه‌م له‌شكرى ريك خست بو شـــام به‌رياستى ابوعبيده‌ى بن جراح ، هيشـــتا ئه‌م‌له‌شكره له شاما بو خالدى بن وليدى له عراقه‌وه هه‌نارد بو معاونت‌يان له شام‌و ابوعبيده‌ى عه‌زل‌كرد

وه خالدی کرد به آمری لەشکر • لەم‌اثنایەدا لە بیست‌و دوی مانگی جمادی الاولی لە عمری شەست‌و سی‌دا متوفی بو وه لە حجرەی سعادتا دفن کرا (ض) •

## (درسی سی‌و شەشەم) خلیفەی دوهەم عمر الفاروق (ض) :

ئەم‌ذاتە صاحب‌شهامته ناوی عمرو کنیەی ابو حفصه ، باوکی ناوی خطابه دایکی ناوی حنتمه‌یه وه له باپیرەی حه‌وتم‌دا (لؤی) ئه‌گات به حضرت (ص) • حضرتی ابوبکر له نه‌خوشینی وفات‌یا بانگی کرد وه به حضوری جماعتی له اصحابی کرام عهدی خلافت‌نامەی بو نوسی وه له پاش وفاتی ابوبکری صدیق هه‌مو بیعت‌یان پی‌کرد ، وه مدتی ده‌سال‌و شه‌ش مانگ خلافتی کرد ، وه له عهدی خویا زور اسلامی به‌رز کرده‌وه • حه‌زره‌تی عمر انسانیکی به‌غیرت‌و عزیزنفس‌و فکرساف بوه ، له حیاتی حضرتا (ص) له کباری مشورت‌پی‌کروان بوه •

له هه‌ژده رووداودا هه‌رچون فکرو رأی نشان‌داوه آیت له‌سه‌ر موافقه‌ی نازل بوه ، وه له مده‌ی خلافتیا تاریخی هجری دامه‌زران بو مبدئی حساب • قاضی له محاکم‌دا دانا ، دفتری مرتزقه‌ی گرت ، حسابی واردات‌و صادراتی حکومه‌تی اسلامیه‌ی راگرت عراق‌و شام‌و مصری فتح کرد ، بلادی کوردوستان‌و ارمنستان‌و قفقازیه‌ی استیلاء کرد ، قسمیکی مهم له

لەغەربو جنوبی ایرانی فەتح کرد • ئینجا لە اثـری طعنـی ابولؤلؤەی ناپاکـەوە شـهید بو ، لە روژی بیستو شەشی ذی‌الحجە لـــە عمری شەستوسی‌دا وفاتی کرد وە لە حجرەی سعادتا دفن‌کرا (ض) •

**(درسی‌سی‌وحەوتەم) خلیفـەی سـی‌هەم عثمان ذی‌النورین (ض) :**

ئەم‌ذاتە صاحب حیاو ایمانو احسانە ناوی عثمانە لقبی (ذی‌النورین)ە ، باوکی ناوی عفانـــە ، دایکی ناوی (اروی)یە لە باپیرەی سی‌هـەمدا کە عبدالمنافە ئەگات بە حضرت (ص) • حضـرتی عمر (ض) کـــە زخمدار بو وسعتو طاقتی تعیینی خلیفەی نەما فقط مسئلەکـــەی بە (شوری) لەبینی شەش کەس لـــە اصحابی کرام : علي ، عثمان ، طلحە ، زبیر ، سعد بن ابی وقاص ، عبدالرحمن بن عوف دانا •

لە پاش وفاتی حضرتی عمر ئەم‌ذاتانە حضـرتی عثمانیان تعیین کرد وە هەمو اصحاب بیعتیان پی‌کرد چونکـــە زۆر خزمـــەتی بەدەنی‌و مالی بـــەدینی ئیسلام‌کردبوو لە حیاتی حضرتا (ص) حتی حضرت (ص) لە دوای ئەمە کە حضرتی عثمان بیری رومـەی سەند بە هەزار دینار بو اصحاب وە لەشکری مشهور بە (جیش العسرە)ی بەصرفی مالی خوی معاونت کرد ، فەرموی (اشتری الجنة مرتین عثمان) یەعنی دودفعە عثمان بە صـــرفی مال لـــە ریگای خوادا بەهەشتی کړی •

ئەمذاتە لە ایامی خلافتا اعمالی بەقیمتی کرد زور مملکت لەوانـــە کە لـە پاش وفاتی حضـرتی عمر عصیانیان کرد گرتنیەوە ، جزائـری (قبرص) وە (جرید)و (رودس)ی لە بحری ابیضی متوسطا گرت وە زور جیگای لە ئەفەریقادا فتح کردو فتحی مملکتی عجمی تەواو کرد ٠

وە لەبەر ئەمـــە کە (قرآنی عظیم) بە محفوظی بمینیتەوەو اختلافـی تیا پـــەیدا نەبی لـــەپاش مشورت کردن بە اصـــحاب، لجنەییکی پیکەوەنا وە حضرتی علي کوری ابو طالبی کرد بەرئیس ٠ لەژیر اطلاعی ئەمانە حەوت نسخەیان لە قرآن نوسیەوە ، یەکی کیان کە مشهورە بەمصحفی امام لە مدینـەی منورەدا هیشتەوە باقیەکەیان نارد بو مکە ٠ شام ٠ کوفــە ٠ بصـرە ٠ بحرین ٠ یەمـەن ، تا مسلمانان نسخەیان لیبنوسنەوە ٠ حضرتی علي (ض) شکری ئەم فەرمانە بەقیمەتەی کردو فەرموی ئەگەر رئیسی اسلام بومایە زوتر ئەمایشەم ئەکرد ٠ حضرتی عثمان لە پاش ئەمە کە مدەی دوازدە سالی الا چـەند روژی خلافـــەتی کرد لـــە عمری هەشتاودوسالیا لـــە هەژدەهەمی ذیالحجەدا بە شهیدی لە دنیا دەرچو وە لـە مقبرەی جنـة البقیعدا لە مدینـــەی منورە دفن کرا (ض) ٠

**(درسی سیو هەشتەم) خلیفـەی چوارەم علي کوری أبو طالب (ض) :**

ئەمذاتە مقدسە ناوی علی وە کنیەی ابوتراب وە لقبی اسداللّٰەیە • باوکی ناوی عبدالمنافە وە مشهورە بە ابوطالب دایکی ناوی فاطمەیە • لـەپاش وفاتی حضرتی عثمان اصحابەی کـرام بیعتیان پی کرد • ئەمذاتە لەگەڵ ئەمە کە شەخصیکی عالمو عالیهمت وە شجیعو بەغیرتو سخاوت بو وە امل ئەکرا وەکو آثاری گەورەی بو لە حیاتی حضرتا (ص) لە زەمانی خلافتی خویا نتائجی حسنەو اعمالی بە قیمتی ببی ، بەلام مع الأسـف غوغای داخلیـە میدانی نەدا وە لەدواییدا بە دەستی انسانیکی شقاوت کردار لـە طائفەی بنیمراد شهیدکرا ، وەختی صبح لە شاری کوفـەدا لەسالی چلی هجری لە عمری شەسـتو سیسالیداو لە کوفەدا دفن کرا • مدتی خلافـەتی چوار سالو نو مانگ بو •

لە پاش وفاتی حضـرتی علی ئـەهلی حلو عقد بەیعەتیان کرد بە حضرتی حەسـەنی کورری ، وە شەش مانگ خلافـەتی کرد ، فقط لـە نتیجەدا بو خاطری اصلاحی عالمی اسلامی تنازلی کرد لەخلافەت وە تسلیمی کرد بە حضرتی معاویە ، بەم پینج شخصە مدەی خلافەت گەیشت بە سیسالوەکو حضـرت (ص) بیانی فەرموبو •

**(درسی سیو نوهەم ) بەحثی باقیەکان ئەکات لە ( عەشەرەی مبشرە ) :**

دیارە چوار لەوەدەیە چوار خەلیفەکان بوون • پینجەم (طلحة) ئەم ذاتە مشهورە بە طلحةالخیر

وه طلحة الفياض ، باوكی ناوی عبدالله‌یه · له باپیره‌ی شه‌شه‌میا كه ناوی (مره) بوه ئه‌گات به حضرت (ص) وه له‌پیش هجرت‌دا له مكه مسلمان بوو له‌گه‌ل اصحابه‌كانا هجرتی كرد بو مملكتی حه‌به‌شه ، وه له حه‌ربی (احدا) فدائی حضرت بو وه‌كو په‌روانه به‌ده‌وری حضرتا (ص) ئه‌گه‌ررا وه مدافعه‌ی دوژمنه‌كانی ئه‌كرد ، له‌واثنایه‌دا شمشیریكیان داهیناوه بو حضرت (ص) ئه‌و ده‌ستی دایه به‌ری له‌م‌خسوسه‌وه ئه‌و ده‌سته‌ی شه‌ل‌بوو ·

وه له‌پاش هاتنه‌وه‌ی له حه‌به‌شه‌وه بو مدینه‌ی منوره حضرت (ص) عقدی برایه‌تی له‌بینی ئه‌وو سعدی بن ئه‌بی وقاصا به‌ست · له مانگی جمادی الاولی له تاریخی سی‌ی‌وشه‌شی هجری‌دا له عمری شه‌ست‌و چوار سالیا له بصره شهید كرا · مقبره‌ی مباركی له بصره‌یه ·

مشهوره ئه‌م‌ذاته مباركه له پاش سی‌سال له وفاتیه‌وه رویشته خه‌وی بعضی اقاربی خوی شكاتی ته‌رری قبره‌كه‌ی كرد · كه قبره‌كه‌یان هه‌ل‌دایه‌وه راست‌بوو ته‌رربو له‌به‌ر ئه‌مه له‌وقبره نقل‌یان كرد وه به‌ده‌نی مباركی ساغ‌و سليم بو وه‌كو ئه‌وسعاته كه وفاتی كردبو · خودای تعالی له‌وو له باقی اصحابه‌كان راضی بی هه‌مویان ·

شه‌شه‌م (زبیر)ه ئه‌م ذاته كورری عوام بوه وه له باپیره‌ی چواره‌می حضرتا كه ناوی (قصی) بوه نسبی

ئەگات بە حضرت ، دایکی صفیەی کچی عبدالمطلبو پوری حضرت (ص) بوە • زبیر لە فداکارانی حضـرت بوە لە حەربی‌احد وە حەربی خندق‌دا حضــرت زور تعریفو ثنای فەرموە ، لە سالی سی‌ی‌وشەشی هجری لە عمری شەستو چوار سالی‌دا لە نزیکی بصـرەدا شهید کراوە ، وە قبری لەوی معروفو مشهور وە زیارت گاهی مسلمانانە •

حەوتـەم (ابوعبیدە) (ض) ئەمذاتــە کورری عبداللەی کورری عامری ملقب بەجراح بوە ، لە (فهر) ا کە با پیرەی دەهەمینی حضرتە نسبی ئەگات بەحضرت (ص) : ئەمذاتە لـە مکەدا لە ئـــەوائلی اسلامیتەوە مسلمان بو وە لە معتبرانی اصحابی حضرت بوە • حضرت (ص) فەرمویەتی لە امتی هەمو پیغەمبەری کا پیاویکی زور ئەمین بوە وە ئەمینی ئەم امتی منەیش ابو عبیدەیە ، لە غەزای بدرو غەزای احدا حازر بوە • وەختـــی کە لــە هیزی پـــەیکانی دوشـمنەوە (زری‌و خودە) رویشت بەروی مبارکی حضرتا (ص) ابوعبیدە بەددان ئەوزری‌یەی دەرهینا ، لە اثری ئەم زحمتەوە ددانی پیشوی دەرهات • لە سالی هەژدەی هجری لە عمری حەفتاو سی‌دا لــە شاما بـەطا عونی مشهور بە (طاعوونی‌عمواس) متوفی بـو • قبری مبارکی لە (سلع) مشهورو معلومە (ض) •

هەشتەم «سعد» ئەمذاتە کورری مالکی مشهور

به ئه‌بی‌وقاصه ، له باپیره‌ی حه‌وته‌می حضرتا کـــه ناوی کعب بوه نسبیان ئه‌گات به‌یه‌ك • حضـــرتی سعد له اوائلی اســـلامیته‌وه مسلمان بو ، وه لـــه معتبرانی اصحابی حضرت‌بوه‌و مستجاب الدعوه بوه هه‌ر دوعاییکی بکردایه قبول‌ئه‌بو ، له فنی تیره‌ندازیا ماهربوه ، زور حه‌رب‌و فتوحاتی له اسلاما هه‌یه ، له‌سالی پـــه‌نجاو پینجی هجری له عمری حـــه‌فتاو سی‌سالی‌دا له (عقیق) که موقعیکه له نزیکی مدینه‌ی منوره‌دا متوفی بو • قبری مبارکی له مدینه‌یه •

نوهه‌م (سعید) ئه‌م‌ذاته کوړری زیدو له باپیره‌ی حه‌وته‌ما ئه‌گات به حضرت وه له اوائلی نشأتی اسلاما مسلمان بووه‌وحازر بوه له حه‌ربه‌کانا ، له سالی په‌نجاو یکی هجری له عمری حه‌فتاو چوار سالی‌دا له مه‌دینه‌ی منوره‌دا متوفی بو ، مه‌رقدی مبارکی له مدینه‌یه •

ده‌هه‌م : (عبدالرحمن بن عوف) ئه‌م ذاته کوړری عـــوف کوړری عبد عوف بوه له باپیره‌ی پینجـــه‌می حضرتا (ص) نسبیان به‌یه‌ك ئـــه‌گات ، له اوائلی اسلاما مسلمان بوه‌و صـــاحبی ثروت‌و مالیکی فوق العاده بو • به‌م‌ماله‌ی زور خزمه‌تی به اسلام کردوه له حه‌ربه‌کانا حازر بوه ، له سالی سی‌ی‌ودوی هجری له عمری حه‌فتاوپینج‌دا له مدینه‌ی منوره متوفی بو • مه‌رقه‌دی مبارکی له مدینه‌یه (ض) اجمعین •

ئه‌م ده‌که‌سه ناویان هـــه‌یه له دوشعری فارسی‌دا بویادگار ئه‌یان نوسین :

ده‌كه‌س كـــه مبشرند ميــدان
بوبكرو عمـــر عليو عثمـــان

طلحه‌استو زبير ، ابو عبيـــده
سعداستو سعيد ، عبدالرحمان

## (درسی چلهه‌م) بحثی امامانی مجتهدین ئه‌كا :

ئه‌م امامانه شه‌شه‌ن ، چواريان له فروعی دينـا اجتهاديان كردوه وه دوانيان له اصولی دينا ، يه‌عنی مسائلی اعتقاديه ٠ ئـه‌وچوار امامه كـه لـه فروعا اجتهاديان كردوه امام ابوحنيفه ، امام مالك ، امام شافعی ، امام احمد بوون ٠ وه ئه‌و دو امامه كه لـه اصولا اجتهاديان كردوه : شيخ ابوالحسنی اشعری وه‌شيخ ابومنصوری ماتريدی‌يه ٠ امام ابو حنيفـــه (ض) ناوی نعمانه باوكی ثابت وه له كوفه له تاريخی هـــه‌شتای هجری‌دا لــــه دايك بوه ، وه لــــه تاريخی سه‌دوپه‌نجاه‌دا وفاتی كرد ٠ عمری حــــه‌فتا ســــال‌بوه ، مرقدی مباركی له به‌غدايه ٠٠٠ خودای لی‌راضی بی ٠

امام مالك (ض) ناوی مالك ، باوكی ناوی انس بوه ، له مدينـــه‌دا له تاريخی نه‌وه‌دی هجری لــــه دايك‌بوه‌و له سه‌دو حه‌فتاو نوی هجريدا له مدينـــه وفاتی كرد ، وه عمری نه‌وه‌دسال بوه وه مرقدی لــه مدينه‌ی منوره‌يه ٠ خودای لی راضی بی ٠

امام‌شـــافعی (ض) نـــاوی محمده باوكـــی ناوی

ادریسه ، له باپیرەی سی‌هەمی حضرتا (ص) نسـبی ئەگات بە حضرت (ص) ، له تاریخی سـەدو پەنجای هجری‌دا له غەزه ، لەدایك بوه ، له تاریخی دوسەدو چوارا متوفی بوه ، عمری مبارکی پەنجاو چوار سال بوه ، مرقدی مبارکی له قاهرەی مصره (ض) ٠

امام احمد : ئەم‌ذاته کورری حنبل وه له طائفەی بنی‌شیبانه ، لـه تاریخی سەدوشەســـت‌و چواری هجری‌دا متولد بوه ، له تاریخی دوسەدو چل‌ویـەکا متوفی بوه ، مرقدی مبارکی له بەغدایه ٠ (ض) ٠

ئیمامی اشعری ناوی‌علی‌یه ، کنیەی ابو الحسنه ، مشهوره به اشعری له جدی نوهـــەما ئەگات بـــه ابوموسی‌ی اشـعری صحابی مشـــهور ، له تاریخی «٢٧٠»ی هجری‌دا لەبصره متولدبوه وه له تاریخی «٣٠٣» متوفی‌بوه ، قبری مبارکی له بەغدایه ٠

ئیمامی‌ماتـــریدی ناوی محمـــده ، کنیـــەی ابومنصوره مشهوره به ماتریدی چونکه لەماترید که موقعیکـــه نزیکی شـــاری سمرقند ٠ له تاریخی ٣٣٢ هجری متوفی بوه ، قبری مبارەکی‌له شاری سمرقنده ٠

ئەم‌امامانه لەســـەر حق‌و هدایتن وه مذهبیان موافقی کتاب‌و سنته وەهەر کەس تقلیدی یـــەکی لەو چواره بکا لـــه فروعا وه تقلیدی یەکی لـــەمدو امامەی دواییانه بکاله اعتقادا ئەوه ئەهلی نەجاته ،

خودا نەجاتمان بدا بەلطفو مرحمتو استقامتمان بی بدا لەسەر ریگەی شریعتی محمد المصطفی (ص) ٠

سبحان ربك ، رب العزة عما يصفون وسلام على المرسلين والحمد لله رب العالمين ٠

**سیشەمە دوانزەی مانگی شەعبانی سالی**

**١٣٥٨ی کوچی ـ بیارە ـ هەلەبجە ـ سلیمانیە**

## بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله العليم الخلاق ، والصلاة والسلام على سيدنا محمد المتمم لمكارم الاخلاق ، وعلى اله وصحبه وكل من جاهد لنصر الدين والاتفاق .

لەپاش پیش‌کەش‌کردنی (حمدو ثناو صلاةو سلام) عەرزم ئەمەیە لەبەر ئەمە کە حەزرەتی محمد (ص) فەرمویەتی : هەر موسوڵمانێ چل‌حدیث لـــە حدیثەکانی من لەبەر بکاوە بێگەیێنی بە موسوڵمانان شەفاعەتی بۆ ئەکـــەم لە قیامـەتدا ، وەدووبارە فەرمویـەتی خوای گـــەورە ناردومی بۆ ئـــەوەی خۆورەوشتی جوان لە دنیادا تەواو بکەم ، چل حدیثم لە حدیثەکانی خوورەووشت هــەڵبژارد ، وەبەپێی ریوشوین معنام بیان‌کردن وە تفصیلمدان ، وە لەبەر ئەوەی کـــە مەولانای جامی ـ خوا لیی خوش‌بی ـ لەسەر هەر حدیثی لەوانە ، دوشعری فارسی داناوە ، منیش دووبارە دووشعرم بە زوبانی کوردی نوسی ، تا مندالانی موسوڵمان ، لە بەریان‌بکەن ، وە دڵیان بە نوری معنای ئەوحدیثانە روناك‌ببیتەوە ، وە ئـەم دەفتەرە موبارەکەم ناوناوە چل حدیثی پیغەمبـــەر (ص) یا « چل چرای اسلام » وعلى الله التوكل وبـــه الاعتصـــام .

## حدیثی یەکـەم

## ( خیر الناس انفعهم للناس )

یعنی : چاکترین ئادەمیزاد کـــەسیکە قازانجی زوتـــــر بی بۆ ئادەمـــیزاد ، جا وەســـــیلەی قازانج گەیاندن بــە ئادەمیزاد چوارشتە ، یەکــەم لەش : پیویستە انسانی موسوڵمان هەر خدمەتیکی بۆ بگونجی بەلەشی خوی لەگــەڵ موسوڵمان بیکا ، وەکو خزمەت و دەرمان کردنی نەخۆش ، دەس گرتنی کوێر ، شارەزایی کردنی غەریب ، ئاوونان هاوردن بۆ هاوڕی • دووەم نفوذە : یعنی دەسەلات ، پیوستە لە سەر انسان مادام پیاویکی قسەڕەواو بەحورمەت بۆ هەوڵ بدا بەوشەرەف و حورمەتی خۆیەوە قازانج بگەینی بە موسوڵمانان ئەگەر داماوێك هاواری بۆ هاورد ، هەوڵبدا رزگاری بکا ، ئەگـــەر مستحقی وەظیفەیەك تشبثی پی کرد اهتمام بکا لەسەر ئـــەو وەظیفـــەیە دای بمـــەزرینی ، ئەگـــەر کاسبیکی بی دەس مایـــە پەنای پی هینا ، لـــەلای کـەسیکی دەوڵەمەند دەس مایەی بۆوەرگری •

سی هەم : مالە : پیویستە انسان مادام سەروەتی هەبو ، پیشەکی هەرحەقیکی شەرعی لەسەرە بیدا بە مستحقان ، لە پاش ئەوە هەرمحتاجیکی بەرچاو کەوت بەگویرەی تواناى خوی ماڵی بۆصـرف بکا ، داخلی ئەمەیـــە ، سیلەی رەحم و بەخشـــش بەقوم و

خویش ، چاکە لەگــەڵ دراوســی ، سەرپەرەشتی هەتیوان ، جیگەکردنەوەی غــەریبان ، حورمــەت ، گرتنی میوان ، دروست کردنی مزگەوتو قوتابخانەو پردو خستەخانە ٠

چوارم عیلمە : پیویستە هەرکەس عیلمیکی دینی یا دنیایی بو ، بەبیدریغو تقصیر نیشانی بدا بــە موسوڵمانان ، بە تایبەتی بەوانە کە اهلی استعدادن، دەرەجەو روتبەی ئادەمیزاد لای خوای گەورە بەپیی زوری قازانجیتی ٠ لەمبابەتانەوە کە بیانمان کرد ٠

مەولانای جامی فەرمویەتی :

ایکە پرسی کە بهترین کــەس کیست
گــویم ازقــول بهترین کەســـان

بهترین کس کســـی بود کە ز خلق
بیش باشــد بــە خلق نفع رســـان

منیش نوسیومە :

گەر ئەپرسی لە چاترین بەشـــەر
کییــە لەمعالەما ، بەنصـــی خبر

چاترین بەشـــەر کەسیکە کە وا
نەفعی زورتر بدا بەنەوعی بەشەر

## حدیثی دووەم

## ( العلم لا یحل منعــە )

یعنی : درووست نییە منع کردنی علم لە خەڵق ٠

بی گومان هیچ شتی نی یـــه له دنیادا بـــه بی علم ری بکه‌وی ، به علم خوا ئه‌ناسری ، به‌علم ئادابی دین به‌راستی جی به‌جی ئه‌کری ، به‌علم دووست‌و دوژمن له‌یه‌ك جیائه‌کرینـــه‌وه ، بـه علم ئه‌سبابی یارمه‌تی

دوست‌و مدافعه‌ی دوژمن په‌یدا ئـــه‌کری ، به‌علم ژیانی دنیاو قیامه‌ت ده‌ست‌ئه‌خری ، به‌کورتی علم بنچینه‌ی هه‌مو به‌ختیاری‌ییکه بۆیه خوای تـه‌عالاو پیغه‌مبـه‌ر (ص) لـــه « قرآن‌و حدیثا » زور تعریفی

علمیان کردووه ، وه کومه‌ڵی ئاده‌می‌زادیان له‌سه‌ر پیداکردنی علم هه‌ڵناوه‌و حه‌زره‌ت (ص) فه‌رمویه‌تی ( اطلبوا العلم ولو بالصين ) یه‌عنی : به‌دوای علم‌دا بگه‌رین‌و داوای بکه‌ن با له‌وولاتی چینیشدا ده‌ستتان

بکـــه‌وی ، هه‌ندی لـه تی گه‌یشتووان فه‌رمویانه : سه‌رچاوه‌ی به‌ختیاری ئاده‌می‌زاد حه‌وت‌شته : عقڵ ، علـم ، دین ، أدب ، بیستنی حق ، خوشـــه‌ویستی ئاده‌می‌زاد ، هه‌ڵگرتنی ناره‌حه‌تی‌لی‌یان ، وه علـــم

سه‌رچاوه‌ی هه‌مو ئه‌مانه‌یه جگه له‌عقڵ که ســـه‌ر چاوه‌ی علمه • بنا له‌ســـه‌ر ئه‌مه هه‌ر که‌ســی منعی اسبابی به‌ختیاری له ئاده‌می‌زاد بکا شایانی به‌دبه‌ختی ئه‌به‌دی‌یه ، ئـــه‌وه‌نده هه‌یه له‌به‌ر ئـــه‌وه‌ی که علم

گه‌وهه‌ریکی زور به‌نرخه پیویسته به‌که‌سی پیشان بدری که اهلیت‌و ئاماده‌گی‌بی •

مه‌ولانای جامی فه‌رمویه‌تی :

ای گرانمایـه مـرد دانشـور
کـــه ترا علمو دین بود معلوم

مســتعدرا ازان مشــو مانــع
مستحق‌را ازان مکن محـــروم

منیش نوسیومه :

هەرکـەسی علمی خوی بلّی بـەغبی
عمرو علمی بـە دەفعەیی تەلەفـە

بۆ زەکی چاکە علمی تو ، بـــەمثل
قەترە بارانە ، ذهنی ئەو سـەدەفە

## حدیثی سی‌هەم

**( لا یؤمن من احدکم حتی یحب لاخیه ما یحب لنفسه )**

یەعنی : هیچ کەس لە ئیوە ئیمانی تەواو نابی ، تا حەز نەکا بۆ برای دینی خوی ، هەرشتی کە حەزی پی‌ئەکا بۆ خوی .

ئەم‌حدیثە یەکیکە لەوچوار حدیثانە کـە ئادابی چاکەیان تیاکوبۆتەوەو ، مقصودی حەزرەت لـــەم حدیثـــــە ئەمەیە هـــــەمو موسولّمانی لەگـــەڵ موسوڵمانانی‌تر ئـــەوپەڕ دەرەجە ناسراوی ببی تا کاروباری دنیـــاو قیامـــەتیان ریك‌وپیک بـــی ، بێ‌گومان‌کە هەمو موسوڵمانی حاڵی وابوو ئـەوەی بۆ خوی حەزی پی‌کرد بۆ غـــەیری خویشی حـــەزی پی‌بکاو ، هەرچی بۆ خوی حەزی پی‌نەکا بۆ غـــەیری

خویشی حەزی پی نەکا ، وە هـەموکەس لە چاکـــەو خراپەدا وەکو خوی بزانی ، بنالەسەر ئەمە هەمیشە چاکەیان لەگەڵ ئەکاو زەرەرو نارەحەتی یان لی لا ئەدا ، موسوڵمانی تریش کە ئەم طبیعەتەیان بۆدەرکەوت ، ئەم کەسەیان خوش ئەوی و ئـــەوانیش طبیعەتیان چاك ئەبی و هەمویان خەریکی یارمەتی یەکتر ئەبن ، بەرەنگیک هەرکـــەس لەخیریکا دیارنەبی ، وەکو حازر بەشی بۆ دائەنریت ، وە هیچ کەس تەنها بەدوای مقصودی تایبەتی خوی دا ناگەرری ، کە موسوڵمانان حاڵیان وای لی هات بە بەختیاری دنیاو قیامەت ئەگەن .

مەولانای جـامی فەرمویەتی :

هەرکەســـی را لقب مکن مؤمن
گرچە از ســـعی جان و تن کاهد
تا نخواهـــد بـــرادر خـــودرا
آنچـه از بهر خویشتن خواهـــد

منیش نوسیمە :

نی یـە ئیمانی بی خەلەل بۆ کەس
گەرچی وەك روحە بۆ هەموانســان
تا نـــەحوببینی بۆ برای دینـــی
وەکو بۆ خـوی منافع و احســـان

# حدیثی چوارەم

## ( لا یشبع المؤمن دون جاره )

یەعنی : انسانی موسوڵمان بەبی دراوســـیی تیر نابی ٠

مقصودی حـــەزرەت (ص)لەم حدیثە شـــریفە هەڵنانی موسوڵمانانە بۆ حورمەت گرتن‌و چاودیری دراوسی‌کانیان ، چونکە دراوسی لەبەر ئەوە کە نزیکی انسانە ، وەکو لە پەنای انســـانا بی وایە ، وە بۆ کەسی کە شـــەرفی ببی زور شووورەیی‌یە چاودیری کەسی نەکا کە لە پەنایا بی ، زیاد لەمە دراوسی لەبەر نزیکی ئاگایان هەیە لە دراوسیی خویان ، ئەگـــەر خواردەمەنیەکی خوشیان ببی منداڵەکانیان ئاگادار ئەبن وە نەفسیان پیوە ئەبەسری ، لـــە سورەتیکا انسان یارمەتیان نەداو بەشیان دانەنی ، زور نزیکە ئەوخواردەمەنی‌یەی ئـــەیخون ببی بە نـــەخوشی‌و ناساغی لە لەشیانا ، دوبارە بی‌بەش‌کردنی دراوسی لەخیرات پیچەوانەی برایەتی اسلامی‌یە ٠ لە « بخاری شریف »دا هەیە : زور دراوسی لـــە روژی قیامەت‌دا دراوسیی خـــوی ئەگری‌و ئـــەیبا بو خزمەتی خواو شکاتی لی ئەکا ، ئەڵی : خوایە ئەم‌دراوسیی منە لە دنیادا دەرگای لەسەرم دائـــەخست‌و خیراتی خـــوی لی‌ئەگرتم ٠

دراوسی ئەگەر کافر بی تنها حەقی دراوسی یەتی هەیە ، ئەگەر موسولمانیکی بیگانە بی حەقی دراوسی یەتی و موسولمانی یەتی هەیە ، ئەگەر خویشی بی حەقی دراوسی یەتی و موسولمانیی و خویشی هەیە ، حەزرەت (ص) فەرمویەتی : ئەوەندە جبرائیل ـ سەلامی خوای لی بی ـ لە بابەتی دراوسیوەوەسیەتی بو کردم خەیالم ئەرویشت کە لە پاش مردن دراوسی لەمالی دراوسی میرات ئەبا ·

مولانای جامی فەرمویەتی :

هەرکە در خطەیی مسلمانی
باشد از نقد دین گرانمایە
نبود ازفضل حق عجیبو غریب
بنشیند گرسنە همسایە

منیش نوسیومە :

اعتبارم نی یە بە صدقی کەسی
لی بدا لافی دینو عقلو کمال
لەو بەسەرچی زمان بەعیشوفرح
لەدراوسی بەئیشو دەردو وبال

## حدیثی پینجەم

## ( المستشار مؤتمن )

یەعنی : کەسی تەگبیری پی کرا ئەوە بە ئەمین دانراوە ·

کەوابی پیویستە لەسەر انسان لەهەر مەتلەبیکا

تەگبیری پی کرا بــــەبی خەیانەت هــــەرچی ئەزانێ دەری ببڕی ، حتی لە کاتی تەگبیر کردنا غەیبـــەت درووستە ، مثلا ئەگــــەر کەسی پرسی لـــەتو حالی فلان کەس چونە ؟ ئاخو بۆ ئەوە ئـــەشی هاوری یی

بکەم یانە ؟ وەتویش ئەتزانی حالی خراپە ، پیویستە بەیانی ئەو خراپی یەی بکــەی تا ئەوکابرایە کـــە تەگبیرت پی ئەکا خوی لی لادا • حقیقتی تەگبیر ئەمەیە انسان هەروەختی فرمانی هاتەرێ ی ، بەر لە ئەمــە دەستی پی بکا داوای تەگبیرو پرس ورا بکا بەخاوەن عقل و تی گیشتوەکان تا ئــەوان هــــەرریگاییکیان

بەباش زانی ئەم کەسە بەوریدا بروا ، وە هەر ریگایی بەخراپ بزانن خـــوی لی لادا • تەگبیر ســــەبەبی سەرکەوتنی دین و دنیایە چونکـــــە هەرمەتلەبیك کومەلی لی ی کولیبنەوە چاکەو خراپەی دەرئەکــەوی وە ئەهلی ئەومەتلەبە بەچاوروشنی خەریکی ئـــەو فرمانە ئەبن تەگبیر کردن لە ئایینی اســـلاما زور

ئەهمیەتی پی دراوە ، خوای تعالی ئەمری فەرموە بــە پیغەمبەر (ص) کە لە کاروبارا پرس بە هاوری کانی بکا وە لــە تعریفی پیغەمبــــەر (ص)و هاوری کانیا فەرمویەتی (امرهم شوری بینهم) یــەعنی فەرمانیان

لـــەناو خویانا بەتـــەگبیرە حـــەزرەت (ص)زور موسولمانانی لــە سەر تەگبیرکردن هــــەل ناوە مثلا فەرمویەتی (الحزم ان تشاور ذا رأى ثم تطیعه) یعنی بیری ساغ ئەوەیەلە کاروبارا تەگبیر بکەی بەکەسیکی

خاوەن عقل لە پاشا چی بو دانای بەگوێی بکەی بەلام پیویستە ئەو کەسە تەگبیری پی ئەکری عاقل و دوست و ئەمین بی ،چونکە لە تەگبیر کردن بە انسانی بیعقل یا دوژمن یا نائەمین لەزەرەر زیاتر هیچ پەیدا نابی ·

هەندی فەرمویانە : ( المشورة محك الامانة ) ، یەعنی ئەمینی خەلك لە تەگبیر پی کردنیانا ئاشکرا ئەبی لەواقعا هەرکەس لەتەگبیرا خەیانەتی نەکرد ئەو کەسە بەراستی ئەمینە ·

مەولانای جامی فەرمویەتی :

هەرکە در مشورت امین تو شد
گرچە باشد امان روی زمین

چون نهان‌دارد آنچە مصلحت‌است
خائنش خوان بحکم دین امین

منیش نوسیومە :

اعتبارت نەبی ئەمینە کەسی
گەرچی مەشهوری عالەمە بە ئەمین

تا بە دڵ وەختی مەشوەرەت بیغەش
ریی نەجاتت لەبو نەکا تأمین

## حدیثی شەشەم

## ( المجالس بالامانة )

یەعنی : جوانی و شەرفی مجلس بە ئەمینی

دانیشتوانی ئەو مجلیسەوەیە ، واتە : مجلس بەم شەرطە جوانو خاوەنشەرفە کە دانیشتووەکانی لەسەر نهینییەکانی ناوخویان ئەمین بن وە ئاشکرای نەکەن ، بەلام ئەمە وەختی وایە کە دانیشتووانی ئەو مجلسە خەریکی حەرام نەبن ئەگەرنا پیویستە هەرکەس بە نهینی یەکانیان بزانی دەریببری وە بو بەرهەلستی ئەوپیلانە تیبکوشی · مقصـودی حەزرەت (ص) لەمحدیثە شریفە هەلنانی موسولمانانە لەسەر شاردنەوەو پەنهانکردنی نهینی ، بیگومان شاردنەوەی نهینی زور صفتیکی بە ئەهەمییەتە ، بەشاردەنەوەی نهینی ناموس ئەپاریزری ، گیانو مال ئاگاداری ئەکرین کومەل بەیەکەوە ئەبەسرین · زور کومەلبوون بەواسـطەی پەنهانکردنی نهینی خویان هیزیانگرتوەو بە ئامانجەکانیان گەیشتون ، بنالەسەر ئـەمە پیویسـتە انسـانی موسولمان پاریزگاری نهینییە چاکەکانی اسلامبکات ، ئـەرنا ئەکەویتە تەنگو چەلەمەوە ، ئەووەختە سەرپەنجەی خوی بەداخو پەشیمانییەوە ئەگەزیت وە سودیشی نابیت ، بویە حەزرەت «ص» فەرمویەتی : ( استعینوا علی قضاء حوائجکم بالکتمان ، فان کل ذي نعمـة محسـود ) ، یـەعنی : کومەك پەیدا بکـەن بو جیبەجیکردنی پیویستییەکانتان بەپەنهانکردنی ئەوپیویستییانە چونکە هەموخاوەن نعمەتی بەخیلی پیئەبری ، ئەگەر ئارەزوی خوی لای هـەموکەس

دەربری وا ئەبی لە گەلیکیانەوە زیانی توش ئەبی • حەزرەتی علي ـ كرم الله وجهه ـ فەرمویەتی : ( سرك اسيرك فان تكلمت به فانت أسيره ) ، یەعنی : نهینی دلت دیلتە ، کە ئاشکرات کرد ئـــەو وەختە تو دیلی ئەوی وە پیی گیرودە ئەبی • هەندی لە تیگەیشتوان ووتویانـــە : چاكترینی صفەتەکانی ئادەمیـــزاد دوصفەتــە :

سخاوەت بەمال لە ریی خیرو حق بەخیلی بە سرر لەگەل هەمو خەلق • دانایان فەرمویانە : بیهیزترینی ئادەمیزاد کـەسیکە نەتوانی نهینییـــەکانی خوی بپاریزی ، وە بەهیزتریان کـــەسیکە لە کاتی رقو کینەدا بەســەر طبیعـــەتی خویدا زالبی یـــەعنی لەوکاتەدا قسەو فەرمانی ناباری لیدەرنەکەوی •

مەولانای جامی فەرمویەتی :

ای‌شـــده محـرم مجـالس راز
راز هر مجلســی امانت تســت
مکن افشـــای راز هـــر مجلس
زانکه افشای ان خیانت تســت

منیش نوسیومە :

ســری مجلس ئەمانەتیکە وەهــا
حفظی ئەو حفظی مالو جاەو سەرە
هەرکەسی سری خوی بلی بەمو بەو
توشی داخیدەرونو دەردی ســەرە

## حدیثی حەوتــەم

## ( القناعـة مال لا ینفد )

یەعنی قەناعەت مالیکە نابریتەوە ٠

قەناعەت ئەمەیە انســـان رازی بی بەو ئەندازە خوای تعالی پیی ئەدا لە خواردنو خواردنەوەو جلو بەرگو شتیتر ، وە دلی خوی نەبەستی بە تەماعو ئارەزوی زیادەوە ، وە بە سەروەتو مالی خەلقیش دلی نارەحەت نەبی ٠

قەناعەت قازانجی دینیو دنیای زورە ، قازانجی دینی ئەوەیە ئەوانەی کە بە بەشــی خویان رازین وە هەولی تالان کردنی مالی خـــەلك نادەن لـــەروژی قیامەتدا توشی لیپرسینەوەی زور نابن ، چونکە مالی خــەلکیان نەخواردوە ، وە جگە لەمـــەش خوا خیری زوریان بو ئەنوسی چونکە بە بەشی خویان داکەوتونو صبریان کردووە ، قازانجی دنیاییشی ئەمەیە لـــە تەنگوچەلەمـــەکانی ژیان خویان پیرائـــەگیری وە ئەتوانن بژینو توشی سەرشوورریو منەتی هـــەمو نامەردیك نابن ، بەلام ئەوانەی کە هەمیشە خویان فیری بـــەرگی جوانو خواردەمـــەنی خوشو جیگای رەحەت کردوە کە نارەحەتییەکیان بەســـەراهات بەگورجی ئەروخینو جلـــەوی خویان لەدەســـت دەرئەچی ٠

قەناعەت مەعنای وانییە کە انسان هەول نەدا

بو بەختیاری خوی وە لەسەر ذەلیلیو هەژاری خوی بهیلیتەوە ، چەندەها ئایەتو حدیث هەن کە خـــەلك بانگك ئەکەن بو ئەوەی کاسبی بکەن وە ژیانیکی پر لـــە کامەرانی پیکەوە بنین ، مەبەس لـــەو ئایەتو حدیثانەی کە خەلق بو زهدو قەناعەت بانگك ئەکەن ئەوەیە انسان بە هەموو ریگاییکی راستو چـەوتا هەلپە نەبا وە نەیەوی مالی خەلك زەوت بکاو بو خوی کو بکاتەوە ، لەلاییکەوە یـــەکی بەئینتەلا بمری ، لەلایەکی تریشـــەوە یەکیکی ، تر لەبرسـا گیانی دەرچی ، بەشی زوری ئەوئایەتو حدیثانەی کە داوای زهدو قەناعەت ئەکەن دەرهەق بـە دەولەمەندەکانی قریش ووتراوون کە بەسودو فایزو پیلانی شەیتانانە شانی عەرەبە رەشو رووتەکانیان قورس کردبو ، ئەمروش لە جیاتی ئەوەی کە ئەو ئایەتو حدیثانە بو ئەو دەولەمەندانە بخوینرینەوە کە بە فایزو غـەش مالی موسولمانان ئـــەخون ، داخی گرانم بەســـەر ئەوانەدا ئەخوینرینەوە کە بەیانی تا ئیواری بەرەنجی شانو عەرەقی ناوچەوان هەول ئەدەن کەچی هـەر لەمەینەتو دەردی سەری رزگار نابن ، وە وایان حالی ئەکری کە ئەبی هەتا ئەمرن لەســـەر حالی خۆیان بمیننەوە ، وە هیچ هەولو تەقەلایەك نەدەن بو چاك کردنی ئەوضاعی خویان ۰

مەولانای جامی فەرمویەتی :

ناخوش له دنیادا ئابرروی ئەبا ، بویەووتویانـه :
قەرز له بی مروەت تالانی مالو حورمەته ، سیھەم
مادام کەسی عادەتی گرت بەقەرز کردنەوە بەئومیدی
ئەوە که پارەی دەس‌ئەکەوی جلەوی خـوی لەدەس
بەرئــــەبی ، وە خووئـــەگری به اســـــرافو
پارەخەرج‌کردنــەوە ، چوارەم که انســـان عادەتی
بەقەرزکردنەوە گرت زور جار مەجبوری ئەکـــەن
بـەوە که ( فایز )ســـود بدا به خاوەن پارەکه ، وه
معلومه سود دانیش وەکو ســـود کردن گوناهیکی
گەورەیه ، پینجەم : چونکه قەرزار هەمیشـــه داوای
پارەی لی‌ئەکەن هەرگیز بەئارەزوی خـوی دەستی
ناکەویته کاسبی‌یەوە • شەشەم : قەرزار بەبی ئیذنی
خاوەن‌قەرز هەر سفری بکا حەرامه وه لەوسفره ،
هـــــەرچی روخصـــەته بو موســـولمانان وەکـو
کورت‌کردنەوەو کوکردنەوەی نویژ ، بوئەو کەسه
دروست نی‌یه • حەوتەم : قەرز کردن زور دەردیکی
کاری‌یه بو خوشەویستی : زور دوســـتو برابوون
بەواســـطەی قەرزکردنەوە دلیان لەیەك ئیشاوە ،
وەناوبەینیان تیك‌چووە ، بنالەســـەر ئەمـه زور
پیویسته تاممکن ئەبی انسان قەرز نەکا وه هــــەر
وەختی قەرزی کرد له ئەندازەی خوی لانەدا ، وەبیری
دانەوەی ببی ، وەتا ئەتوانی زو بیداتەوە •
مەولانای جامی فەرمویەتی :

نکشـــد بهـــر مال دنیـــا رنج
هرکــه خواهد کمـال بهرەی دین

جهـرەی دینمەکن بنـاخن دیـن
تانکاهـــد جمـــال چهـرەیدین

منیش نوسیومە :

قەرز بە گویرەی حدیثی پیغەمبەر
واسـطەی نقصی حورمەتو دینـە

وەکو زەهرە جگـەر ئەکا لەتلـەت
هوی پەیا بوونی عاجزیو قینـــە

## حدیثی سیو پینجەم

## ( من حسن اسلام المرء ترکه ما لا یعنیه )

یـەعنی : لەجوانی موسولمانەتی انســـانە واز هینانی لە شتی کە مقصدی نەبی ٠

ئەگەر موسولمانەتی ئەم پینج رکنە مشهورە بی وەکو شهادەتو نویژو روژووو زکاتو حج ئەوە مەعنای ئەمحدیثە وایلیدیتەوە : انسان با بە تەنها ئەوە کە ئەم فرمانانە بەجیبینی بە موسولمان بژمیرری ؛ بەلام وەختی موسولمانەتییەکەی جوانو خاوینە زیاد لــە کردنی ئەوانەیش واز لە شتی بیسود بینی ، وە خوی خەریك نەکا بە فرمانی غیرەمطلبەوە ، وە ئەگـــەر موسولمانەتی عبارەت بی لە بەجیهاوردنی هـــەمو ئادابی شـرعی وەکو کردنی واجبو سنتەکان ، وە دورکەوتنەوە لــە حرامو مکروە ئـــەمجار مەعنای حدیثەکە وایە باانسانی موسولمان هـــەمو واجبو سنتی جیبەجی بکا وەواز لەهەمو حرامو مکروهی

بینی ، وەختی موسولمانەتی یەکەی جوانو دیاری یـە
کە پاریزگاری ببی لە شتی حلالی بی سود ، چونکا
فرمانی حلالیش مادام کە قازانجیکی شرعی تیا نەبی
لە خەریك بونیا وەختی انسان بەخوررایی ئەفەوتی ،
وە طبیعەتی ئەگوری ٠

ئەم حدیثـــە اصلیکی راســتو دروســـتە بو
پاك کردنەوەی دەرون لە ئەخلاقی سوكو خراپە ، وە
هەموو موسولمانان بانگ ئەکا بو ئـەوە کـە ژیانی
خویان تـەنها بو بەختیاری دنیا بـــەکاسبی حلالو
ریکخستنی هەرچی بە کەلك بی بو کامەرانی ژیان ،
وەبو بەختیـــاری قیامـــەت بـــە بەگوی کردنی
فەرمودەکانی خوا صرف بکەن ، وە خویان لادەن لـە
بەجی هینانی ئارەزوی نەفسانیو حەزی جانەورانە
وەکو نوستنو خواردنو خواردنەوەی لە ئـەندازە
بەدەر ، وە خەریك نـــەبن بەشتی بی سودەوە وەکو
زیادەرەوی لە دامەو شەترنجو فرمانی بی ســـودی
ترا وەکو قسەی زورو گەرانی ناوەخت بـە بازاررو
کولانو جادەو دەشتو دەرا ، ئەمفرمانانە ئەگـــەر
گوناهیشیان لی پەیدا نەبی خو بە خوررایی وەختی
ئادەمیزاد ئەکوژن ٠ مەشهورە پیاوی چاوی کەوت
بە لقمانی حکیم لە مجلسیکا دانشتبو ، ئاموژگاری
دانیشتوانی مجلسەکەی ئەکرد وە ئەوانیش زور بە
حورمەت تەماشایان ئەکرد ، پیاوەکە پیی ووت ئەی
تو خذمتکاری فلان هوز نەبوی ؟ فەرموی بەلی ، ووتی

ئەی بەواسطەی چیەوە ئەمپایەت دەست کەوت ، فەرموی بەواسطەی سیشتەوە ، یەکەم : قضـــاو قدری خوا ، دوهەم : راستی لە قسەکردنا ، سیهەم : وازهینان لەشتی بیقازانج •

مەولانای جامی فەرمویەتی :

تا شــود درجهــان علمو عمـــــل
شـــاهد دین تو جمــال افـــزای
زانچــه درخــور نباشـــدت بازآی
زانچـــه لایق نباشـــدت بازآی

منیش نوسیومە :

عمری انسان ژمارەیە بــە نَفَس
ئەوە دەسمایە بو تجارەتی کـەس
حەیفە ضـــایع ببی بە پوچو عبس
بو کەسی کەس بی ئەم ئیشارەیە بەس

## حدیثی سیو شەشـــەم

## ( زُرْ غِبّاً تَزْدَدْ حُبّاً )

یەعنی : هــەر بەینی نەبــەینی برو بو دیدەنی دوستو برات ، تا خوشەویستیت زیاد ببی •
ئەگەر کەســی بیـــەوی خوشەویستی لەگـــەل برادەریکیا زیاد ببی ، حقی وایە کەمکـەم دیدەنی ، چونکە ئـەگەر کــەم دیدەنی کرد هـــەمو وەختی لـــەوماوەدا کـە لەیەك ئـــەبرین ئاگری اشتیاقو

خوشەویستی هەل ئەگیرسی وە بە دل گەرمی ئەچی دیدەنی ئەکا ، وە بە خوشی ئەگەرریتەوە بەلام ئەگەر زور دیدەنی بکا خوشەویستی‌یەکەیان کەم ئەبیتەوە لەبەر چەند دلیل ؛ یەکەم : مادام هەروەختی حەزی کرد چاوی بەوبرایە کەوت ئەودوستە لەبەر چاوی بی‌ئەهەمی‌یەت ئەبی ، وە بە طەبیعەت وەکو هاورری‌یەکی عادەتی‌لی‌دی ، مەشهورە : بویە روژ لە هاوینا قدری نی‌یە چونکە هەمیشە دیارە ، وە بویە لەزستانا خوشەویستە چونکە کەم کەم دەر ئەکەوی ·
دوهەم لە هات‌وچوو هەلسان‌و دانیشتنی زورەوە واتەبی چاوی بەکردەوەو رەفتاری نامناسب ئەکەوی وە ئەمە ئەبی بە مایەی ناکوکی‌و دل لەیەك ئیشانیان.
سی‌هەم : لەتیکەلی هەمیشەیی‌وە انسان توشی بی‌ئەدەبی ئەبی ، وە بی ئەدەبی مهمترین ئەسبابی لەناوچونی خوشەویستی‌یە ، چوارەم هەمو وەختی ئەو برایە وەختی ئەوەی نی‌یە بروا بولای ، واتەبی خەریکی فرمانیکی تایبەتی خویەتی ، یا حەزی لە تەنهایی‌و حەسانەوەیە ؛ حەزناکا بە چاوپیکەوتنی کەس ، وە ئەگەر کەسی برروا بولای پی‌ی ناخوشە ، ئاشکرایە دیدەنی وا لەبی‌محبەتی زیاتر قازانجیکی لی‌وەرناگیری ؛ بویە ووتویانە : عهدو پەیمان بە حیات ، دیدەنی دوست بە سەعات ·

مەولانای جامی فەرمویەتی :

دیدن دوست دوست را گەگە
چهرەی دوستی بیاراید

زاتفـــاق دوام صحبتشـــــان
شـــــوق كـامل ملال افـــزايد

منيش نوسيومه :

هەر كەسی حەز ئەكا لە دوستو برا
كەم كـــەمی دیدەنی بكا لی‌یـــان

نـــەك وەرسیان‌بكا بە دیدەنی زور
بو ئـــەوەی زیـــاد بكا محبتیـــان

## حديثی سی‌ی‌و حەوتەم

## (من أعطی لله ، ومنع لله ، وأحب لله ، وابغض لله ، فقد استكمل ايمانه)

یەعنی : هەركەس لەبەر خوا شت‌بدا بەخەلق ، وە لەبەر خوا لی‌یان بگریتەوە ، وەلەبەر خوا خەلقی خوش بووی ، وەلەبـــەر خوا رقی لی‌یان‌بی ئـــەوە موسولمانیکی تەواوە .

مثلا ئەگەر كەسی رەفتای چاكو رەوشتی جوان بو لەبەر ئەوە كە بە گویرەی شـــرع ئەجولیتەوە ، انسان یارمـــەتی بدا ، وەهەركاتی كـــە روی كردە رەفتای خراپو رەوشتی ناشیرین لەبەر ئەوە كـــە لەگوناهایە هیچی نەداتی ، یا خود برادەریكی ببی تا بە دیانەتو روشت‌بـــەرز بی خوشـــی بووی ، وەهەر كە روی كردە بی‌دینی رقی لی‌ی بی وە وازی لی‌بینی ، ئەوە نیشانەی تەواوی ئیمانە .

ئەمحدیثە هەمو موسولمانان بانگ ئـــەکا بو ( اخلاص ) : اخلاص ئـــەوەیە انســـــان هـــەر فرمانی بکا بەنیازو خیالیکی باش‌و دلیکی خاوینەوە تەنها لەبەر رەزای خوا بیکا ، نەك لەبەر پیشاندانی بەخەلق ، یا بوئەوەکە خـــەلق بیبیسنەوە ، یا بو ئەوە کە ناوبانگ دەرکا وەلە هەمو لایکەوە خـــەلق دەست بکەن بە مدح‌و تعریف‌کردنی ، انسان ئەگەر

هوش‌و فامی ببی ئـــەزانی ملاحظـــەی غیری خوا لەعبادەت‌کردنا بی‌عقلی‌یە ، چونکە بشر هەمو وەك یەك ضعیف‌و محتاجن ، وەلە خوا زیاتر لە دەســـەلاتی کەسا نی‌یە لە ریگاییکی غەیبی‌یەوە قازانجی یا زیانی بگەیینی بە یەکیکی‌تر ، وە هـــەر عبادەتیك بو ریا بکری خوا ئەی‌داتەوە بەناو چاوی خاوەنەکەیا .

بەگویرەی حدیث هەرکەس نیازی دلی چون بی خوا بەگویرەی ئەو نیازەی لەگەلیا ئـــەجولیتەوە ، حضرت «ص» فەرمویەتی : ( ما أسر عبد سريرة الا البسه الله ردائها ، وان خيراً فخير وان شراً فشـــر ) ،

خولاصەی مەعناکەی ئەمەیـــــە هەرکەس هەرشتی لەدلی خویا دابنی ، خوای تەعالا بەگویرەی ئەوشتە لەگەلیا ئەجولیتەوە ، ئەگەر نیازی چاکی بوبی خوا چاکەی بو ئەکا ، وەئەگەر نیازی خراپەی بوبی خوا

خراپەی لەگەل ئەکا ، بنا لەسەر ئەمە پیویســـــتە انسانی موسولمان هەول بدا هەر فرمانی ئەکا تەنها لەبەر خوابی تا خواش لی‌ی قبول بکا ، بعضی لـــــە

تیگەیشتووان ووتویانە : چوار شت هەن بەچوار شت دەست ناکەون : رەحمی خوا بـە عیبادەتی ریا دەست ناکەوی ، خوشەویستبون لای خەلق بـە بەدخویی دەست ناکەوی ، وەفای دوستو برا بەبی وەفایی دەست ناکەوی ، علمو معرفت بە تەمـەلیو حەسانەوە دەست ناکەوی ٠

مەولانای جامی فەرمویەتی :

انکـە در حبو بغضو منعو عطـا
نبودش دل بـــەغیر حق مـــائل

نقـد ایمـان خویشـرا یابـــد
برمحك قبـــول حـق کـــامل

منیش نوسیومە :

هەر کەسی حبو بغضو منعو عطای
خالصـــە بو خـــودای عزوجل

مژدەبی دینی کاملـــە بە خودا
رەحمی خوای پی ئەگا لە کاتی اجل

## حدیثی سیو هەشتەم

## ( الجنة تحت اقدام الامهات ، من شئن ادخلنا ، ومن شئن اخرجنا )

حەزرەت ئەم حدیثەی دەربارە صحابی‌ییك فەرمو کە ئەیویســـت بچی بو غـــەزا ، بـــەلام دایکی نەی‌ئەهیشت ٠

مەعنای ئەم حدیثە وایە : بەهەشت بو موسولمانان لەژیر پیی دایکیانایە ئارەزویان لە هەر کەس بو ئیذنی ئەدەن بیخەینە لەشکرەوە بو غەزا ، ئارەزوشیان لەهەر کەس نەبو دەری ئەکەین وە نایەلین بچی بو غەزا ئەم حدیثە هەلنانیکی زوری تیایە بو موسولمانان لەسەر بەگوی کردنی دایکیان ، ئەم حدیثە بەئاشکرا ئەلی : غەزا بەوهەمو ئەهمیەتەوە کە هەیە تانەبی بەفرضی عین ـ یەعنی تا دوژمن هیرش نەهینیتە سەر وولاتی اسلام ـ بەبی ئیذنی دایك حەرامە ، ئەمە شتیکی سەیر نییە ، لە راستیدا دایكو باوك حەقیان لەسەر مندال زورە ، وەلە پاش ارادەی خوا بەتأثیری باوكو دایك ، وە بە زەحمەت کیشانی ئەوان پەیدا ئەبیو پی ئەگا ، بەتایبەتی دایك کە زەحمەتیکی زور ئەچەژی ، نو مانگ بە پیستی سك هەلی ئەگری ، کە پەیدا ئەبی مەینەتیکی زوری توش ئەبی ، گەلی جاریش گیانی خوی دائەنی ، ئەنجا بە دریژایی سالانی شیر خواردنی تا پی گرتنی ئەبی بەدیاریەوە شەونەخونی بکیشی ، وە کە گریا رای‌ژەنیو شیری‌بداتیو ژیری بکاتەوە ، ئەگەر خویشی شیری نەبو مال بەمال بیگیرری ، یا شیری بوبکرری ، ئەبی لەشو بەرگی بشوریو چاودیری بکا ، سەرەرای ئەم هەموئیشو ئازارانەش ئەوەندە بەرەحمە ئەگەر مندالەکەی توشی ناساغی‌ییك بو حەسانەوە لەخوی حەرام ئەکا بو

خاتری چاودیری ئەو ، لەبەر ئـەمەیە جزادانەوەی بەخیریدایكو چاكە لەگـەل كردنی زور لـــەباوك پیویستترە ، وەكو حەسەنی بەصری فەرمویەتی : ( حق الوالد اعظم ، وبر الوالدة اكرم ) . یــەعنی : حقی باوك گەورەترە ، بەلام چاكەكردن لەگەل دایكا پیویستترە .

مەولانای جامی فەرمویەتی :

سـر ز مادر مكش كـه تاج شرف
گردی از پای مادران باشـــد

خاك شـو زیر پای آن كه بهشت
در قدمهـای مادران باشـــد

منیش نوسیومە :

دابیكی خوت لەســـەر سەرت دانی
دایمەنی قەت لەمالو منزلو دەشت

گەر بەخذمەت بررویتە ژیر قدمی
هەرلەویوە ئەرروپتە باغی بەهەشت

## حدیثی سیو نوهەم

## ( لیس الشدید بالصرعة : انما الشدید الذي یملك نفسه عند الغضب )

یەعنی : ئازا ئەو كەسە نییە كە خەلق زور بدا بەزەویدا ؛ ئازا ئەو كەسەیە كە خوی بگری لەكاتی ررق هەستانا .

بەم چەشنە کــــە لەکاتی ررقهەستانا بتوانی مەنعیررقەکەی بکا ، وە ئەگەر هەر زوری پیهینا خوی بگری لەقسەی ناشیرینو کردەوەی نارەوا ٠ لیکدراوەتە کە ررقهەستان زور خوییکی ناشیرینە ، حتی بعضی لە تیگەیشتووان ووتویانە هەر شەرری کە توشی انسان ئەبی یا لە حەزو ئارەزوی نفسەوەیە یا لـــە ررق هەستانەوەیە ، مثلا کوشتن ، بریندار کردن ، جویندان ، ناشکوری کردن ، طلاقخواردن ، سویند خواردن ئیشاندنی دلی دوســـــتو برادەر ، وازهینان لەکەسو کار ، وە امثالی ئەمانە هــــەموو لەخووی ررقهەستانەوە پەیدا ئەبن ، وە زور کەس بوون لە وەختی ررقهەستاندا گیانیان دەرچووە ، بنالەسەر ئەمە زور پیویستە انسان ئاگای لەخوی بی ، وەهەر چون بووە منعی رقهەستان لەخوی بکا ، وە ئەگەر بە ناچاری ررقی هەستا خوی لەقســـەی کردەوەی ناشیرین بپاریزی وە بو ئەمە چەند وەسیلە هەیە ، یەکی لەوانە بیرکردنەوەیە لەگەورەیی خوای تەعالا کە دەستی ئەرروا لە جزای ئەم ررق هەستانو ناشیرین ووتنەدا انسان لەناو بەری ؛ یەکیکی تریان بیرکردنەوەیە لە اجرو ثوابی ئەهلی حلمو حەوسەلە ، وە ووردبونەوەیە لەمە ئەگەر خوی رابگری لەوەختی ررق هــەستانا خوا جەزای ئەداتـــەوە ، یەکیکی تر لەوانە دەستنویژ گرتنە ، یەکیکی تر لەوانە ئەوەیە ئەو جیگەیە بەجی بهیلی ، وە برروا بو جیگەییکی تر ٠

( بیداری ) : ررق‌هەستان وەختی ناشیرینه که بەناحەق بی ، چونکه ررق هەستان لەسەر حق زور شتیکی جوان‌و بەجی‌یه ، حەزرەت «ص» بەو هـــەمو حلم‌و حەوسەلەوه که بووه زور جار لەسەر اموری دیانت بەتوندی عاجز بووه ، امام احمد خوا لی‌ی‌رازی بی فەرمویەتی : ( نهاية الكمال الغضب في موضعه ، والحلم في موضعه ) ، یەعنی : ئاخر دەرەجەی تەواوی بو انسان ئەوەیه له جیگاییکدا ررقی هەستی کـــه موناسبی ررق هەستان بی وه له وەختیکا حلمی ببی که مناسبی حلم بی .

مەولانای جامی فەرمویەتی :

پهلوان نیســت آنکه در کُشتی
پهلوانـــی دگـــر بینـــدازد

پهلوان آن بود که گاه غضـــب
نفس امـــارەرا زبون ســـازد

منیش نوسیومه :

پالەوانی ئـەوه نی‌یه که بـه زور
خەلق زەلیل کەیت‌و لات‌و مال‌ویران

پالـەوانی وەهایـه خـوت بگری
له خراپه لەکاتی ررق هەستان

## حدیثی چل هەمین

## ( المسلم من سلم المسلمون من يده ولسانه )

یەعنی : موسولمانی تەواو ئەوکەسەیە کـــە موسولمانان لە دەستو زوبانی سەلامەت بن ·

بەمەعنایە موسولمانی تەواو کەسیکە نە بەقسە نە بەکردەوە موسولمانان توشی زیان نەکا · نەدەس دریژی بکا بو مالو گیانو ناموسیان ، وە نە لەپاش ملە ناویان بەری وە قسەی خراپیان پی بلی وە جوینیان پیبدا · وە بوختانیـــان بوبـــکا وە ناوو ناتورەی ناشیرینیان بو هەلبەستیت ·

پیویستە لەسەر هەمو انسانی چاودیری حقوقی خواو هەمو خەلق بکا · وەبزانی کە بەتەنها چاودیری حقوقی لایەکیان نەجاتی نابی بەلام لەبەر دوشـــت لەمحدیثەدا تەنها باسی حقوقی خەلق کراوە· یەکەم : چونکە بو ژیانی دنیا چاودیری کردنی حقوقی خەلق گرنگترە ، چونکە ئەگەر انسان لەمدنیادا چاودیری حقوقی خەلق نەکا ناژی ، وە دنیا پرر ئەبی لە شەررو ئاژاوەو کوشتنو بررین ، کەئەمەش ناشی ببی ، بە پیچەوانەی ئەمەوە ئەگەر چاودیری حقوقی خـــوا نەکا گوناهەکەی تەنها بو خویەتی ، وەهەر خـــوی توشی زیان ئەبی ، وە مەسئەلەکە ئەکەویتە بـــەینی خویو خوای خویەوە ، خوایش ارحم الراحمینە دوز نی یە کە لیی ببوری · دوهەم لەبەر ئەمە مادام انسان

حالی لەگەل خەلقا باش بو زور نزیکە حالی لەگەل خوای خویشـــیا باش بی ، وە بـەگویرەی فەرمودەکانی بجولیتـەوە وە هـــەرچی پیویستی بـەندەگی بی جی بەجی ی بکا .

مەولانای جامی فەرمویەتی :

مسلم آنکس بود بەقول رسـول
گرچی عامی بود وگـر عالـــــم
کـە بەهـەر جا بود مسـلمانی
باشـد از قولو فعل أو سـالم

منیش نوسیومە :

بەصریحی حەدیثی پیغەمبەر «ص»
ئـــەو مسلمانە دینی ساغە کـە وا
لە زبانو لە دەستی سـالم بی
هەرکەسی باوەرری هەیـــە بـەحوا

**اللهم اجعلنا من المسلمين الذين يسلم المسلمون من ايديهم والسنتهم سـبحان ربك رب العزة عما يصفون وسلام على المرسلين والحمد لله رب العالمين .**

**١٣٧٣ی کـوچی ـ ١٩٥٤ی زایینی**
**سـولەیمانی ـ مزگـەوتی حاجی‌حان**

## بسم الله الرحمن الرحيم

بــەناوی ئەوخالیقەی کــە کامیلەو بەکەرەم
بەخشندەیەو میهرەبان خاوەنی «بەیتوحەرەم»

ســـەناو سوپاسیکی وا کەمی‌ی نەمینی لەوا
بو خالیقی ماسیوا بـــەحیکمەتی مونتەظـــەم

دروستی فەرموو هەموو دنیا ، کە هیچی نەبوو
نووسی لە «لەوحا» بەزوو هەرچی ئەبی زوروکەم

ئینس‌و فریشتەو پەری، عەرزو سەماو ئەختەری
هەر ئەو بوو وینەگری لەسەر هەتاکو قـــەدەم

بە لوطفی‌خوی ئەوخودا بە ئادەمی‌ی عـــەقلی‌دا
ایـّــــده بالهـــــدی ، علـّمـــه‌ بالقلـم

هــەم قووەتی عــەقلی‌دا بــە ناردنی ئـــەنبیاء
تەبشــیرو ئینذاری‌دا بــە نیعمـــەت‌و بەئەلەم

ئەزەلی‌یە هـــەر بووە ، ئەبەدی‌یە هەر هەیـــە
تەنیایە بی وینەیە ، خاوەنی حوکم‌و حەشـــەم

قادرو زانایــە ئــەو ، بیسەرو بینایە ئـــەو
خواهشــی بالایــە ئەو ، گویایە بی دەنگ‌ودەم

یا رب صـــلّ عـلی افضـل من أرســـلا
والانبیـــاء ، وعلی مــن اقتـــدا فــي الامــم

[ بریژه ڕەحمەت خوا لە بەحری فەیض‌و صەفا
سەرحەرزەتی موصطەفاو ئەصحاب‌و ئالی بەجەم ](١)

پیغەمبەری ڕەحمەتە بو روحی ئەم ئوممەتە
خاوەنی مەرحەمەتە بو عەرەب‌و بوعەجەم

پیغەمبەری « خاتەمە » بو دینی ئەم عالەمە
ڕەهبەری چەن «حاتەمە» بو بەخشش‌و بو کەرەم

لوقمانی دەردو غەمە ، لوطفی وەکو مەرهەمە
دەوای دەردو ئەلەمە بو قەلبی خاوەن‌ئەلەم

سەروەری گشت عالەمە ، لەم نەتەوەی ئادەمە
بو فەیزی ئەو خادیمە چەن شاهی خاوەن‌عەلەم !

باجی لەسەر سەلەفە ، تاجی سەری شەرەفە
بەلکو شەرەف سەدەفەو ، ئەو دورری فەردی یەکەم

بو چەرخی پیغەمبەری شەمسی سەمای سەروەریی
بودابیرەی ڕەهبەریی « طاها »یە بەدری ئەتەم

هەربەو هەوا هەل‌تەکا شووشەی شەقاوەت شکا
هەر بەوە خوررەم ئەکا بارانی فەیزو کەرەم

لەوشوینە گول بەستەیە ئەو گولی سەردەستەیە
لەوشوینە دل خەستەیە ئەو مەرهەمە بو ئەلەم

هەرئەو پەنای ئەمەلە بو سەردەمی زەلزەلە
سوجدە ئەبا یەپەلەو تکا ئەکا بو ئومەم

---

(١) ئەم بەیتە بو ئەوەیە وەکو سەربەند بەکومەل بخوینریتەوە ٠

جیا لەگــەل عالەما ئەمذاتــە ئیللا لــەما ،
خالیقی عــەرزو ســەما هیناوونی لــە عەدەم

[ رەبی بریژە صــەفا بو رەهبەری ری‌ی وەفا
بو لابــەری هوی جەفا بەحیلمو حوکمو قەڵەم ]

بو ئــەو چرای عالــەمە نووری دلی ئادەمــە
کە رەهبەری خاتەمە بو عەرەبو بو عەجــەم

ئەو شاهی صاحیبسەنا ، ئەو ماهی دوور لە پەنا
کە ئــەو ئەبی بە پەناه بو کاتی ئیشو ئــەلەم

ئەو ئەنوەری ئەنبیا ، ئەو ســەروەری ئەصفیا
لامیع بــە نوورو ضیا دافع لـەبو توزو تــەم

دنیا لەبەحرو لە بەرر ، زەوی لە ووشكو لە تەرر
پرر بولە خیرو لەفەرر ، کەنایە ســەریان قەدەم

نوورەو نەجاتــەو صــەفا ، بو دلی خاوەن وەفا
دەرمانی دەردەو جــەفا ، مەرهەمی ئازارو غــەم

بەشــیری ئــەهلی وەفا ، نەذیری ئەهلی جــەفا
مونیری خاوەن صەفا ئــەمیری خاوەن کــەرەم

مەحببەتی یەك نەفەس بەگیان ئەگەر بیتە دەس
بو ئەهلی مەیلو مەبەس چاترە لە بەیعو ســەلەم

موحەممەدە ، ئەحمەدە ، مەسعوودە ، هەم ئەسعەدە
لە مەرتەبەی دەسمەدە ؛ نایگاتی دەم یا قەلــەم

ئــەو شاهە پایە قــەوی پیغەمبەرانی زەوی
داویانە موژدەی ئــەوی بەعەینی ناوی عەلــەم

هاتووه نیشانەی نەبی‌ی بە عەجەمی‌و عەرەبی‌ی
« مُبَشِّـراً بنبيٍّ » نەقلە لە ( عیسا ) بـــە دەم

خوا کە ناردی روسول پەیمانی فەرمووو بەکولل
بوکومەکی ئەو بەدل ، بو نەشری حەق بو ئومەم

لە نیو سوپای رەهبەری‌ی ، چ ئامیر ، چ عەسکەری
هەر بو ئەوە سەرووەری‌ی ، هەر ئەوە خاوەن عەلەم

وەك پەروانە بوو پەری‌ی بوشەمعی رووی ئەنوەری
بویی وەکو (موشتەری) جوبریل ئەهات دەم‌بەدەم

حەیرانی دەورو بەری زوهرەو سوهاو موشتەری
سەیوانی تاجی سەری چەرخی سەمای مونتەزەم

دنیایـــە بوو هیمەتی ، دەریایە بوو نیعمەتی ،
شەیدایە بۆ تەلعەتی ئەومانگە دەردی لەتـــەم

مەنبەعی صیدق‌و صەفا ، مەجمەعی شەرم‌و وەفا
رەقیبی جەورو جـــەفا ، طەبیبی دەردو ستەم

شەیدای شەمیمی دەری باغی بەهەشتی بـــەری
چـــاکیری دررکی دەری گولباغی دەشتی ئیرەم

چون ئەو ئومیدەو پەنا بو روشنایی‌و ســـەنا
نوختـــەی رەشـــی دانەنا لە کاغەذا بەقەلـــەم

هەر نووره بارەو بەشی ، هەر پاکی‌یەو بی‌غەشی‌ی
دوورە لە لەککەی رەشی‌ی بەروح‌ودل دەست‌ودەم

بو شەرحی صەدری ئەتو ، بو رەفعی ذیکری ئەتو
بو نووری فیکری ئـــەتو ئایەت پررە لـــە حیکەم

رەفیقی فەتحو ظەفەر لە حـەزەرو لە سـەفەر
بو نەفەرو ، بو خەفەر ، لە تیپی تو ، زوروکەم

ونورُهُ فـي الوری عمّ السـما والثـری
بجهـده للهدی ، وصـده للصـنم

[ برریژە رەحمەت خوا ! لە بەحری فەیضو صەفا
سەر حەزرەتی موصطەفاو ئەصحابو ئالی بەجەم ]

## رشتەی نەسەبی لە هەردوولاوە

نەسەبی موعتەبەری بو شەرەفو سەروەریی
هەموو لە لەککە بەریی ، موحتەرەمو موحتەشەم

لەخەبەرا واریدە : ئـەم سەروەرە ساجیدە
هەرکەس بەئەو عائیدە گەورە بووەو موحتەرەم

بەندی دوررو گەوهەرە ، لە مەعدەنی جەوهەرە
حوببی ئـەوان وەرگرە بـەروحودل نەك بەدەم

ئامینەیـە والیدەی ، باسی ئوصولی بکـەی
بە وەهبو زوهرە ئەگەی عبدولەنافی یەکـەم

باوکی بولەند مەرتەبە (عبداللە)ی مونتـەخەبە
لـە ( عەبدی مطلبە ) خاوەنی جاەو حەشـەم

(هاشم) عەتای خوی بەسە، (عبدولەناف) ئەقدەسە
(کلاب)ە پینجەم کەسە (مەررە) یە جەددی شەشەم

(کەعب) ، (لووەی) هەشتەمە (غالب) بلی نوهەمە
(فیهرە) بە حەق دەهەمە (مالیك) لەوی یازدەهەم

(نەضر)و (کەنانە) لەبەر ئینجا [خذیمە] لەسەر
(مودریکی) خاوەن ثەمەر لای عەربو لای عەجەم

(ئیلیاس)ە، ئەنجا (موضەر)، (نەزار)ی عالی سی یەر
موعەدد گەلی موعتەبەر ، عەدنان گەلی موحتەشەم

ئەمرشتە ئەروا هــەتا (قەیدار)ی خاوەن وەفا
کوڕری ذەبیحی (صەفا) ئیسماعیلی موحتــەرەم

سیلسیلەیی بەشەرەف بەرزە لە هەردوو تەرەف
نە لە سەلەف ، نە خەلەف وینەی نەبوو بو کەرەم

لە ئادەمۆ نەســـەبی ، هـــەتا خەلیلی نەبیی
تا بابی خوش حەسەبی ، موحتەرەم لە موحتەرەم

بو حورمەتە ، ئەی برا ! ، کە گەوهەری شەوچرا
ئەبریتــە عالیسەرا لە شوینیکی موعتەصـــەم

چەن کانە ئــەم عالەمە ؟ ئــەم نەتەوەی ئادەمــە
خوش خولکە ، موحتەرەمە ، لە عەرەبا ، یا عەجەم

## پەیدابوونی حەزرەت (ص)

[ بریژە رەحمەت خوا ! هەتا قیامەت لەســـەر
سەردەفتەری ئەنبیاء رەهبەری جینو بەشەر ](١)

ئەوکانی حیلمو وەفا کاتی بــەنوورو صـــەفا
دەرچوو لە پەردەی خەفا روونا کی کرد دەشتودەر

---

(١) ئەم بەیتە وەك سەربەند دەووتریتەوە ٠

بیستەمی نەیسانی زوو بەهاری خوش رەنگ و روو
غونچە بەلیو خەندە بوو لەبەر نەسیمی سەحەر

مانگی رەبیعی یەك بوو ، لە روژی دوانزەهەمی
دووشەممە بوو صوبح دەم هەتاو لەگەل هاتە دەر

بە صوورەتی دلبـــەری نازاری بی‌ســـیبەری
بەشەوقی رووی ئەنوەری (كالشمس ، لا كالقمر)

روون‌بوو زەوی تا سەما تووزو تـەمی تیانەما
خەم جی‌ی نەما لەودەما ، لەم‌عالەمە کەوتـەدەر

ئەم عالەمی پررتەمە ووشـکی نەما ئـەو دەمە
بە نمی ئـەو شەونمە بەخورر ئـەباری لەســەر

کەوتە تەبەسسوم هەموو لیوی جیهان زوو بەزوو
لە عەرزەوە موژدە چوو لە بو فریشتە لە ســەر

فەوجی فریشتەی سەماء بـە نەشئە هاتەسەما
غـــەم لە نیوانا نـــەما ( والدهر قد ازدهر )

میللەتی دل پررلەتەم بە (ئەبرەهە)ی پررستەم
بە نووری بەدری ئەتەم نەشئەی صەفای کەوتەدەر

بە مەقدەمی (موصطەفا) نـــەما نموونەی جەفا
حیجازو مەککەو صەفا پرربوو لـە خیرو لەفەرر

بە شەوقی رروی موصطەفا روشن بوو دەشتی صەفا
بەبای شەمالی وەفا دەرچوو جەفا بو (ســەقەر)

حەق کەوتە جیلوەو سەنا ، باطل بەرەو لای فەنا
نوور دای لـە پیچ‌وپەنا ، تاریکی روییشتە دەر

## ئەو نیشانانەی کە لەپیش لەدایکبوونی دەرکەوتن

بو شەرەفی (موصطەفا) ئەوچلچرای ری‌ی وەفا
زوو هاتەدی‌ی بەصەفا گەلی نیشانەو ئەثـــەر

یەکەم نیشانەی قەوی لەســەر بیســاتی زەوی
پایەی مەجوسی‌ی نەوی ، شوکوهی کەوتە خەتەر

کیسرای قەوارە قەوی ، خاوەن شوکوی خوسرەوی
مەئموری هاتە خەوی ، بی‌ترس‌و بیم‌و حـەذەر

پی‌ی‌ووت مەقامت هەموو تەسلیم‌بکە زووبەزوو
بە مەردی خوش‌خولك‌و خوو ،خاوەن عەسای بی‌زەرەر

پاش‌ئەمە هەیوانی ئەو بو شێوانی‌ناوی ئـــەو
چواردە تاقی بەتەواو شەق بوو لەخوارولەسەر

بەوخەوە پرر وحشەتە ، بەم حادثەو دەهشەتە
ئەوشاهە باشەوکەتە کـەوتە خەیال‌و خەتـــەر

گەورەی موغانی(١) ئەوی ، ئەویش خەوی دی شەوی
خەوی کە دل نەیەوی پی‌ی کەوتە بیم‌و حەذەر :

چەن ئەسپی خوش‌رەوت‌و ررو ،چەن ووشتری نەرم‌خوو
لە دەجلەوە ، دەوبەدەو ، پەرینەوە رووبەسەر

یانی ســـوپای دینە وا بەورەنگە شـــیرینەوە
بەشان‌و تەمکینەوە بـەویا ئەکـــەن ری‌گوزەر

---

(١) موغ : پیاوی ئاینی‌ی ئاگرپەرستەکان ٠

مەجووس لە بـــەد ئەختەری كوژایەوە ئاگری
ئەگەرچی بوون لەسەری چەن جەرەسی باخەبەر

گۆلاوی ساوەی بەفەرر روچوو وەكو دەشتی بەرر
یانی قوراوی بەسەر رروم لەمسەرو كەوتەپەرر

ریگەی جنوكە نـــەما لە هاتووچو بو ســــەما
(كاهن) لە چالی خـــەما داما وەكو كویروكەرر

كە نوبە بی بو هودا ، بو نووری وەحیی خـودا
عەرراف ئەبی بێ صەدا بمری بەصەد دەردیسەر

## ئەوانەی شیریان داوەتیو بەخیویان كردووە

دایەنی شیری ، لەسەر بەیانی ئـــەهلی سیـَەر
یەكەم (ثووەیبە) عەتیقی بوونی ( خیر البشــر )

دووهەم (حولەیمە) ئەویش گەییشتە ئەونیعمەتە
بە فەیزی ئەوخزمەتە ، بو قەومەكەی بوو بە فەرر

دووسال لەناو بادییە ئەو ســەروەرە هادییە
بەم دایەنە (سەعدییە) پەروەردە بوو بیزەرەر

پاش ئەوە هینایـــەوە ، لای والیدەی مایـــەوە
چون والیدی ماجیدی لەمعالەمـــە چوبووە دەر

شەش سالە بوو موصطەفا دایكی بەشیوەی وەفا
هەتا (مەدینە)ی صەفا بردی بەعەزمی ســەفەر

كەهاتنەوە ، دیبـــەدی ، بو والیدەی هاتەجی
كە خاكی (ابواء) ببی بەقـەبری ، نِعْمَ المقرّ !

لە تەمەنی هــــەشتی‌یا باپیرە گەورەی نــــەما
ئینجا لــەلای مامی ما (بوطالب)ی موعتەبــــەر

لــەعومری دوانزە لەگەل ماەی (زبیر)ی بەطــەل
بەهوی تیجارەو عەمەل چووبو یەمەن بەســـەفەر

لەعومری هەژدەدابوو بــە عادەتی کاســـبی
چوو شاری بوصرایشی دیی لە شامی خاوەن ثەمەر

لەمسەفەرا مەیسەرە لای سەری ئەو سەروەرە ،
پارچەیە هەوری ئەدی سیبەری خستبوەســەر

جا شورەتی ئەو وەها دای‌گرت جیهان بەبــەها
(خدیجە) دل‌خوازی‌دا بو عەقدی شاهی بەشەر

ئەویش لەسەر رەغبەتی ، بەئارەزووی عەشرەتی
عەقدی صەفاو عوشرەتی کرد بە بناغەی ثەمەر

## شکوو شیوەی حەزرەت (ص)

وەصف‌و ثەنای بی‌گومان مەحالــــە بو ماسیوا
حەیرانە ئینسان لەوا فریشتەیە ، یا بەشەر ؟

بەبە کە چەن ئەنوەرە ، هــــەتاوی بی‌سیبەرە
نە فریشتە نە بەشەر ، بەمسیرەتە کەوتە دەر

لــــە حوسنی بی‌ئافەتی میانــەبوو قامــــەتی
کەچی لەناو عەشرەتی بەبەرز دەهاتە نــــەزەر

لەبەر شکوهی سەری (زوهرە) بەدل ، (موشتەری)
بوخادمی‌و چاکــــیری ببی بــــە دەربانــی دەر

بەدری دوجای ظولمەتە ، شەمسی ضوحای رەحمەتە
نووری هودای ئوممەتە بو گەلی جینن‌و بەشـــەر

مووی رەشی قوببەی سەری بینداری وەك عەنبەری
تا شانی دائەپەرری دەم‌دەم لەمـــەش کورت‌تر

تـــەویلی خوش هەیئەتی بە زینـــەتی طەلعەتی
کە دەرئەکەوت وات‌ئەدی روژە لەگەل هاتەدەر

دووخەتی ئەبروی شەوی ، وکوو هیلالی نەوی[1]
کەوان‌و تیریش‌موژەی بو قـــەلبی صاحیب‌نەزەر

تەشبیهی چاوی مەکەن بە چاوی ئاهووی خوتەن
خـــەتایە دەم لی‌مەدەن بە نیسبەتی بی‌ئـــەثەر

ئەیدی‌ی لەپشتی سەری وەکوو لەپیش نەزەری
یانی : لەشـــی ئەنوەری پاکە لە توزو کـــەدەر

ئیمامی عاممـــەو ئەبی چاوی لە عالەم هــــەبی
لە راستەوە یا لە چەپ ، لە پشتەوە یا لە بـــەر

نیرگسی چاوی رەشی ئەنوەست وەکو غونچەگول
بەلام لەخەودا بـــەدل بیدارو خاوەن خەبـــەر

رووی پرر لە شەرم‌و حەیای ، قەندیلی دەشت‌و چیای
لە شەوقی نوورو ضیای روژ رووی نەبوو بیتەدەر

غونچەی دەمی ئەنوەری ، بەبینی وەك عەنبەری
عاشق لە بووی موشتەری بەدل ، بەروح‌و ، بەسەر

---

(١) نەو : تازە ،

تفی ئـــەبو بە شـیفا بو زامی دەردو جـــەفا
بە شەرتی صیدقو صەفا بو شاهی (خیر البشر)

بـە صونعی (رب الفلق) سینەی وەکو لاوەرەق
واسیع لەبوو نوری حەق ، لامیع بە وینەی قەمەر

لەسینەیۆ دەر ئەچوو خەطیکی شیرین لـــەموو
طوولی هەتا نافی بوو بە میثلی رەیحانی تـەرر

لای چەپی ناوشانی ئەو ، بو عیزەتو شانی ئەو
هەبوو نیشانی کە بەو شاهیدە ئـەهلی سیەر

بەقەدری هیلکەکەوی ، ئەستیرە بوی ریك کەوی
مەممنوونە بو پررتەوی نووری ئـەوی بیتەسەر

بونی ئەروییشتەدل چاتر لــە نەسرینو گـول
بوی ئەتلایەوە بەکول عەنبەرو میسکی تەتـەر

دەســتی دریژ بوون برا لەبو عـــەتای فوقەراء
دائەپەررین لەســـەرا تا بەندی ئەژنوبــەدەر

چونکە شەهادەی شەرەف بەوگەیی یە شەش تەرەف
پەنجەی شەهادەی لە کەفف ئەعلاو، ئەوان موختەسەر

بوئەوە تا شوینی پیی راس بی لەسەر عەرزی ریی
قوولی نەبوو ژیری پیی بە نـــەقلی ئەهلی سیەر

## پاش بە پیغەمبەربوونی

ئـــەوذاتە مونتـەخەبە کە مەعدەنی ئـــەدەبە
نەك سەرووەری عەرەبە ، بەلکو بو هەموو بەشەر

له ئەووەڵی حالــەوە تا کەوتــە ناوســـالەوە
لەدەر وە یا مالەوە ئەیکرد لە پەستی حـــەذەر

فیکری وەهابەرز ئــەبوو لەم عالەمە دەرئەچوو
بیری لە خالق ئەکرد ، نەك لەزەوی‌و دەشت‌ودەر

کاتی کـــە ویستی خودا یــەکی بگا بــەهودا
فیکری وەهای پی‌ئــەدا پەنای بدا لە خەتـــەر

بەلی هیدایەت کە بوو عەون‌و عینایەت بــە زوو
ئەم روح‌و جیسمە هەموو ئەکا بەخاوەن هونەر

لەبـــەر چرای ئیهتیدا ئەکەوتە یادی خـــودا
لەئەووەل‌و ئیبتیدا ئەکەوتــە دەریای نەظـــەر

هەرســـالی مانگی ، برا ، ئەرویییە غاری (حیراء)
فاریغ لەگشت ماجەرا بەروح ، بە دل ، بە بەصەر

کەسالی چل هاتەدی شەش مانگ هەرچی خەویەدی‌ی(١)
راس‌دەرئەچوو بی‌کەمی‌ی وەکو سفیدەی سەحەر

هـــەتا لــە غاری (حیراء) ریســـالەتی پی‌درا
بوو بە چرای چل‌چرا بو ری‌ی نەجاتی بەشـــەر

دووشەممەبوو هەژدەهەم لە رەمەزانی ئەهەم
(جبریل)ی خاوەن کەرەم وەحیی خودای بردەسەر

چـــەن ئایەتیکی خودا ، لە خەلق‌و عیلم‌و هودا
هینا لەبو ئیهتیداو ، وون‌بوو لە دەرکی بەصەر

---

(١) خەویەدی‌ی = خەوی ئەدی‌ی .

کە وون بوو لی ی ئەودەمە ئــەو خاتەمی ئەکرەمە
وەکویــەکی پڕ رغمە هاتـــەوە دڵ بەحــەزەر

کــە هاتەوە مــەنزلی لەپاش ئیفاقـــەی دڵی
فەورەن بــەبی ماتەڵی کەوتە بەیانی خەبــەر

گیرایـــەوە ماجـــەرا ئەوزاعی غاری (حیراء)
بو هاوسەری دووسەرا ، بو هاودەمی موعتەبەر

پاش باسی ئەم صادیقە ، ئەوهادەمی موشفیقە
بردی یە لای (وەرەقە) زانا بـــەعیلمی ســی یەر

ئەویش بە لەهجەی وەفا فەرمووی بە موژدەی صەفا
ئەوذاتە بی ئیختیفا (جبریل) بوو ، بوت کەوتەدەر

پاش ئەمە سی سالی دی ی ، رووی جوبرەئیلی نەدی ی
وقلبُ حَضــرتِهِ ضــاقَ لــهُ وانحصـــر

تا جاری ئـــەو رووچرا رویبیشتبوو بو (حیراء)
کە هاتەوە بەوســەرا (جبریل)ی هاتە نەظــەر

بە هەیئەتیکی عەجەب ، بەهەیبەتو بە حەسەب
لەدەهشەتا شای عەرەب کەوتەوە لەرزو خەتەر

کــە هاتەوە مالـــەوە بەولــەرزە هــەرمایەوە
پیچای لـــە ئەعزایەوە جلی لــەپی تا بەســـــەر

هەتا لەبو رەهبەری ی (جبریل) گەییشتە سەری
ســووڕەتی (مدثر)ی هینا بەشانو قـــەدەر

ئینجا بەشانو شەرەف حەرزەت لە هەر چوار تەرەف
بەیانی کرد ، وەك سەلەف ، تەوحیدی رەببولبەشەر

صیدیق‌و ، زەیدو ، عەلی ، بیلالی مەشرەب وەلی
عوثمان بە نووری جەلی‌ی گەیین بەبی دەردی‌سەر

طەلحەو زوبەیرو سەعید سەعد ئیبنی عەوفی رەشید
ئەبوو عوبەیدەی شەهید ، ئەرقەمی عالی سیەر

یاران بە صیدق‌و صەفا ئەچوونە لای موصطەفا
بەترســـەوە نـەبادا بگەن بـــە ئیش‌و زەرەر

یەك یەك‌و دودو ئەچوو لای شاهی خوش خولك‌وخوو
تا وەرگرن رووبـەروو ئادابی دینی بەفـــەرر

بوکاتی فیربوونی حەق گرد ئەبوونۆ یەك نەسەق
لای‌شاهی شیوەشیرین ، بەلام بەبیم‌و حــەذەر

هەتا بەرەحمی خودا قـــەبوول بوو لای بارەگا
دوعای ( نبي الهدی ) ئیمانی هینـا عومـــــەر

ئینجا بەشـــان‌وشكۆە عومەر وەکو شـــیری کۆ
کوففاری هینا ستۆە لەشـــارو دی‌و دەشت‌ودەر

شمشیری خوی کردەمل ئەیگوت بە پیاوانی زل
کی زیدی دینە بەدل فـــەرموو دەبا بیتـــە دەر

تا هاتەخوار زووبــەزوو [ فاصدع بما تؤمر ]
بو نەشری دین رووبەروو لە شاری مەککەو لە دەر

جا مەککە کـــەوتە پەلە لە شورش‌و زەلزەلــە
لە زیدی ئەم سیلسیلە بو کردەوەی شورِوشەرر

تائەو شەهی ئەکرەمە فەرمووی لەبەر مەرحەمە
بررونە لای (ئەصحەمە) شای حەبەشی موعتەبەر

یاران لەترس تەلەف چوون بو حەبەش بەسەلەف
لای ئەصحەمەی بەشەرەف مانەوە بیدەردیسەر

یارانی دلبــەوەفا لە دووری رووی موصطەفا
دیلبوون بــەداوی جەفا تا هاتەلایان خەبــەر :

کافرەکان صەف بەصەف چوونەتە سوجدەی شەرەف
بو خالقی شەشی تەزەف (والنجم)ی ناردوونەسەر

لەشەوقی ئـــەم وەحدەتە یارانی ئەمحەزرەتە
گەرچی سەفەر زەحمەتە هاتنەوە مەککەی بەفەرر

دەرکەوت کافران هەموو هەروان لەسەر عەینی خوو
بویــە گەررانەوە زوو لەبو حەبەش بەســەفەر

رەضــای خودا حــــازرە ، هاتنی زور ظــاهرە
بو ئەوکەسەی صابرە لەبەر بەلاو دەردیســەر

ئەرواتە ناو قەلبی حەی بەروژوشەو پەیبەپەی
ئەوەی نەکا باسی وەی لە ئیشـــی دەردوزەرەر

## دەرچوونی بەنیهاشم بو شەعبی عبدالمطلب

ئـــــەمجارە خیلی جــــەفا ، کافرانی بیوەفا
لەبو سزای موصطەفا کەوتنە قەسدی خەتــەر

ئەبی موحەممەد بەزوو لەگەل ئەقاریب هــەموو
بررونە دەر زووبەزوو ، نەکەن بەشــارا گوزەر

خزمان خەملەدل هەموو ، دەرچوون لە مەککە لەبو
شـــیوی ( عبدالمطلب ) دلعاجزو غەملەبـــەر

بەفەیضی جیلوەی قیدەم کە بوی ئەچوو دەم بەدەم
گیان بوو بە بەحری کەرەم دڵ بوو بە کانی ئەمەر

بیستی گەلی سیرری حـــەق لە خالیقی ماخەلەق
ناکری بەحەرفو وەرەق شەرحو بەیانی خەبەر

جاداپەرری لەودەما لە ئــەوجی بورجی ســـەما
عالەم تەمی تیا نــەما لەبەرنەسیمی ســـەحەر

شەهابە ، یا بەرقە خۆی دنیا بەبیفەرقە بــوی
دەستت لە دنیا ئەشوی بزانی چونــە خەبـــەر

## کوچی حەرزەت (ص) بو (مەدینە)

ئینجا بە وەحیی ســـەما وەختی ئیقادەی نـــەما
با (سیّد الکرماء) لـــە مەککە برروا تـــەدەر

هات ئەمری هیجرەت بەحەق لای ذاتی (رب الفلق)
لەبەر شەرری (ما خلق) کەوتە تەهی یەی سەفەر

لەگەل رەفیقی وەفی ، صـــەدیقی دڵ موکتەفی
بە صوورەتی موختەفی لەشـــارەوە چوونەدەر

لەغاری ثەورا لـــەوی مانـــەوە تا سێشـــەوی
بەڵکو هەڵی هەڵکەوی هەتا برروَن بەســـەفەر

بووبەکری خاوەن صەفا ، رەفیقی صاحیب وەفا
پیی خوشی بوو دەردوجەفا لە پیناوی پیغەمبەر (ص)

صـــەدیقی نـــازاری تو ، رەفیقی ناوغاری تو
گولباخی بیخاری تۆ بو تو ئەبوو بەســـوپەر

بەدەوری ئـــەویارەدا مارگـەستی لەوغارەوا
لـەوغارە پررمارەدا بۆ یار ئەکـەوتە خەتـــەر

سێشـەو لەوی مانـەوە ئینجا بەپەنهانـــەوە
وەك روژ لەکیوانەوە طلوعی بوو ، کەوتـەدەر

بەشەرمو شـانو شـکۆە نەسیمی داوینی کۆە
رووی کردە جەبهەی سەروو لە ساحیلۆ بۆسەفەر

هەرچەنە باران نەبوو کەچی ریگاوبان هـەموو
بە یومنی ئەو زووبەزوو پرر بوو لە خێرولەفەرر

لەمسەفەری هیجرەتە لە فەضلی ئەو حەرزەتـە
هەر خاریقەی دەهشەتە دەرئەکەوی بوبەشـــەر

باسی (سوراقە) مەکەن ، لەوخاریقە دەسمەدەن
سیجار لەرری بەبەدەن رووچوو گەبیشتە خەتەر

با بەرگی ( کیسـرا ) ببا لە جائیزەی ئـــەدەبا
خەلات لەلای نوجەباء شمشیرە یا تاجیسـەر

لە ئوممومەعبەد مەدوو ، مەرریکی پیری هەبوو
بە یومنی شا زووبەزوو بوی‌بوو بەجیی‌خێروفەرر

کە شەوقی داوە لەدوور خاوەن صەفای بەرقی‌نوور
ئەنصار گەبینە حوزوور ، حوزووری (خیر البشر)

بـــە عادەتی نوجـــەباء پیشـــوازی‌یان‌لی‌کرا
کە دابەزین لە (قوباء) میوانی زور موعتەبـــەر

روون‌بوو هەموو سەرزەوی بەنووری سیمای ئەوی
تاریکی‌ی کەوتە نەوی‌ی، دەرچوو سوفیدەی سەحەر

راسته ئەمە یا خــــەوە ، بە روژە یا بەشـــــەوە
ئەوخاوەنی پرتەوە لای عاشیقان کەوتە دەر ؟؟

(ئەنصار)ی ئەو روژوشەو پەروانەوینە بەتەو(١)
بوشەوقی روخساری ئەو ئەچوون بەسۆزی جیگەر

چەن خوشە دل ئەودەمە سەرشارو خاترجەمە(٢)
نە میحنەتەو ، نەغەمە ، نە زەحمەتەو ، نە کەدەر

لەمحالــــە ویجدانی‌یە ، میقداری یــەك ثانی‌یە
بەمعالەمـــە فانی‌یە قیمـــــەتی نایبتـــەدەر

پاش موودەتی لە (قوباء) لەگەلگەلی بـــــەوەفا
وەکو شنەی بای‌صەبا چوو بو مەدینەی‌بەفەرر

پیش‌وازی‌کەران بەجەم دلخۆش‌و خالی لەغــەم
سروودی شادی‌ی بەدەم : ( طَلَعَ نـور القمر )

یارانی مەککەش هەموو لە زوروکەم هەرچی بوو
گەیین هەموو زووبەزوو بە حەزرەتی پیغەمەر (ص)

موهاجرینی (حەبەش) پاش زەحمەتی روژی رەش
جەم‌بوون لەلای بەش‌بەبەش بە میثلی هالەی قەمەر

چەن‌خۆشە دل بەصەفا ، لەپاش فیراق‌و جەفا ،
بەیاری خاوەن‌وەفا بگا ، بەبی دەردی‌سـەـــەر !!

جا سەروەری رووچرا فەرمووی : چرا هەلکرا
ئیعلانی ئایین درا بو ئــــەهلی بـــەدوو حەزەر

---

(١) بەتەو = بەتاو ، بەتین .
(٢) سەرشار = مەست ، شاد .

بە وەعظو ئیرشادی حەق ، عالەم طەبەق بەطەبەق
گەیین بە نووری شەفەق دڵشادو دەس بەکەمەر

بەلام بە هوی بەدرەوی‌ی جوولەکەی رەوشت نەوی‌ی
تەم کەوتە سەر رووی زەوی لەبەر تەمای أخذ وجرّ

شیری سپی ئیهتیدا رەش‌بوو بەشیرەی عیـداء
جا وەکو شـــیری خودا ئەصحابە دەرچوو نە دەر

بەدرو ئوحود هاتەروو ، خەندەق‌و خەیبەر بەزوو
بەفەتحی مەککەش کە بوو ، حونەینی پڕ لە زەفەر

ئیمانی ئەهلی «یەمەن» بەســـەبیدی موئتەمەن
حیجازی خستە کەمەن ، ئیسلامی پی کەوتەسەر

## وەصفو ثەنای ئەصحابەکان (رض)

من بم بــــەقوربانی تو ، قوربــانی یارانی تــو
ســینە سپێرانی تۆ بو روژی بیمو خەتــــەر

صەدیەکی باس‌ناکری وەصفی صەحابەی (نبيّ)
دەبی بە بی‌ئەدەبی‌ی دەم‌بیتە نوطق‌و خەبــەر

هــــەموو نوجومی خودا بو رەجمی جننی عیــدا
بەوان لەناوچوو صەدان لــە ئەهلی غەدروزەرەر

بوفەرر هەموو مال تەلەف بو شەرر هەموو گیان بەکەف
کــە دائەمەزران لەصەف ئەباری فەتح‌و ظەفەر

بۆخۆ هەموو نەرمخوو ، دڵئاگرین بو عــەدوو
کاتی ئەبوون رووبەروو دوژمن ئەکەوتە خەتەر

قِف بمقامِ الصفا ، وَصفْهُمْ بالوَفاء
فهمْ هم الشرفاء والصفوةُ في البشر

أجسامهم عَذّبوا ، انفسَهم هَذَبوا
اَجَلْ ، فهم ذَهَبٌ ، وغيرُهُمْ كالغَبر

ئەرواحو مالیان لەلا ، وەکو وەتەن خاكو با
دایان ئەنا بەفیدا تا دینی حەق بیتەدەر

لە ذەوقی هیجرەتی تو ، بە شەوقی نەصرەتی تو
بە عەشقی حەزرەتی تو سەرزەوی‌یان گرتەبەر

بەبە لە (ئەنصاری) تو ، ئەحبابی ئەخیاری تو
فیداکاری گیانی‌تو لە روژی تووش‌و خەتەر

گیانیان فیدابوو لەبوی ، مالیان بە قوربانی ری‌ی
دڵیان لەبەرخاکی پی‌ی تا دابنی پی‌ی لەسەر

موهاجیرین دل‌برین ، ئەنصار بە قوربانی دین
بویە ئەناو ئافەرین ئەهاتەسەریان لەسەر

ئەصحابەکەی (بەدر)ی تو ، قوربانی ری‌ی قەدری تو
لەعەشقی رووی بەدری تو سەرمەستی ذەوقی کەدەر

صِف اهلَ بدرِ الفدا أحياءً أو شهداء
بكل وصفٍ غدا لخيرةٍ في البشر

سیصەدو سیانزە کەسن بەروح‌و دل ئەقدەسن
ئەت‌گوت گولی نەورەسن لەباغی ئیحسان‌و فەرر

فریشتەروو بوون هەموو خوش خولك‌و خوو بوون هەموو
قوربانی تو بوون هەموو، بو تو ئەبوون بە سوپەر

بویی فریشتەی سەما بوون بە مەدەد لـەو دەما
لە بەدردا غەم نەما لە شەوق‌وشادی ظەفـــەر

لە کیوەکەی (ئوحود)ا چـــەن موخلیسی جانفدا
چووە ریزی شوهەدا بەرگی گولی کردەبـــەر

ئەصحابی بەیعەی رەضا ، رازی بەئیش‌وسـزا
هات بو ئەوان بەجەزا ئـەناو رەزای موعتـەبەر

ئەصحابی خیر الرسـل ، ئالی وەکو بەستەگول
پیویستە بو نووری دل حوببی ئەوان بو بەشەر

مەخصوص لە بو خولەفاء ، هاومەجلیسی موصطەفا
مەنبەعی حیلم‌و وەفا ، مەجمەعی دین‌و ئەنـــەر

بووبەکری صیددیقی ئەو ، حازری تەصدیقی ئەو
ناصیری تەحقیقی ئەو ، لە غارو خاری کـــەدەر

هەم یاری خاوەن شکۆە ، شیری دەرو دەشت‌وکو
کوففاری هینا ستوە ، حەزرەتی مەولا عومـەر

عوثمانی کانی حەیا ، دل پرر لە نوورو ضـیاء
دوو نووری شای ئەنبیاء لە مالی ئـەو هاتنەدەر

ئەکبەری ئالی (نبی) هاوسەری زەهرای (نبی)
حەزرەتی مەولا عەلی ، حەیدەری خاوەن هونـەر

نەرگسی شەهلا حسن ، حسین شەقیقەی چەمەن
بو دل ئەبوون بە کەمەن ، بو حەق ئەبوون بە سوپەر

عەباس‌و حەمزەی شەهید زوبەیرو سەعدو سەعید
ئەبوعوبەیدەی رەشید ، طەلحەی حەمیدە سی‌یەر

هەم ئیبن‌و عەوفی میثال بو صەرفی ثەرەوت‌ومال
جەعفەر کە ئەفرری‌ی بەبال ، كما أتى في الخبر

رەزای خوای عالەمین ، لەســـەر ئەوان اجمعین
هەم بو ئـــەوەی تابیعـــە بو دینی خیر البشـــر

## باسی قورئانی قەدیم

[ بابی لە قودسی سەنا ، رەببی ، سەلام‌و ثـــەنا
بو سەروەری ئەنبیاء بو رەهبـــەری ئومەنا(۱) ]

وصـــلِ رَبِّ عـــلى مَن نورُهُ عَمَّنـــا
وَفیـضُ بعثتـــهِ تـــمّ وعـــمَّ لنـــا

من بم بـــە قوربانی تو ، قوربانی قورئانی تو
دەلیل‌و بورهانی تو اظهـرُ مِن شمســـنا

وەصفی قەدیمی خودا ، بی‌حەرف‌و صەوت‌وصەدا
( كلامُ نفسٍ غدا یلمعُ فـــي نفسِـــنا )

وك سائری وەصفی ئەو لازمـــە بو ذاتی ئـــەو
مونەززەهـــە لە عەتـــەب موزەیەنە بە ثـــەنا

هەروا بە صەوت‌و صـــەدا کە لامی‌لەفزی خودا
صـــەدوچوار بەجودا بی‌عەیب‌و پێچ‌و پـــەنا

صەدیان بەحەق صوحوفن بو ئەنبیای سەلەفن
کە مەجمەعی شەرەفن هـــەم لاییقی ئیعتینا ..

---

(۱) ئەم بەیتە سەربەندە ، بە کومەل دەخوێنرێتەوە .

چواریان بەناوی عەلەم ، تەوراتی مووسا یەکەم
زەبووروئینجیلە هەم بوئەنبیای ئومەنا
قورئانە ئاخر رەقەم بو ئەحمەدی موحتەرەم
ناسخی باقی بەجەم ، هەموو چوون بو پەنا
بیدەخلی ئینس‌و پەری ، بیخەتەری موفتەری
پاكو نەزیەو بەریی گەیی بە (خیر الوری )
لەبەر بولەندی قەدر ، لە حەددی عالەم بەدەر
موعجیزی جینن‌و بەشەر ( ولولَه ٌ استظهرا )
جامیعە بو خەیری کول ، بو لەش ، لەبو گیان‌و دل
عەتری وەکو بەرگی گوڵ ئەروا بەدل بەسەرا
بەجەوهەری ئەنوەری لەگەوهەری شەوچرا
دەرکەری ئینس‌و پەری لە میحنەتی ماجەرا
باعیثی نووری دلە ، هاودەم‌و هاومەنزلە
حەللی هەموو موشکیلە لەقەلبی باخەبەرا
شیفایە بو زامی دل صەفایە بو جامی دل
وەفایە بو کامی دل بو ئەهلی حەق ئەیبرا
ئەوکەسە بەومایلە دوورە لەهەر غایلە
ئەوکەسە لەوغافلە دوورە لە نووری چرا
نووری وەها ناری یە لەناو دلا ساری یە
کەسی بەحەق قاری یە ئەگا بە بەهرەو عەتا
بینی لە لای عالیە ئەوی بەدل تالی یە[1]
لە عەنبەرو غالیە ، لە میسکی ئاهووی خەتا

---

(١) تالی : لەتیلاوەتەوە وەرگیراوە ، واتە : ئەوی ئەی‌خوینیتەوە ٠

نه نه جیان لێك ، برا ، بەقــەد تۆرەیاو ثـــەرا
ســـامِحٌ علی ما جَــری بالسـهو منّا اَتی

ئاوی فوراتی صـــەفا بو قــەلبی ئـــەهلی وەفا
لەو کەسە ئەرروا جەفا کە خوی ئەشوا لەوشەتا

خێرو جەزای ئەوەیــە حەرفیکی یــەك بەدەیـــە
زیادە جەزایشی هەیە ئەرروا لەگـــەل نی یــەتا

بەقەد هەموو حەرفی ئەو برژی کەرامەت بەدەو
سەر روحی رەهبەری ئەو هەم بەسەری ئوممەتا

## باسی خوورەووشتی بەرزی حەزرەت (ص)

ئەی شاهی خوش‌خولك‌وخوو ئەی ماهی گول‌رەنگ‌وروو
گیان‌و لەش‌و دل هــەموو بو تو ببی بـــەفیدا

ئەخلاقی خوش‌تەرزی تو لە سونەت‌و فەرزی تو
وەك موعجیزەی بەرزی تو دایەوە دەنگ‌وصەدا

رەوشـــــت‌و عادەتی تو ، زیکرو عیبــادەتی تو
صــەبرو صـــەداقەتی تو ، قیبلەیە بو ئیقتیدا

چون باسی ئەوصافی تو تەواو ئــەکا گوفتوگو
قورئان کە بو نەعتی‌تو «خولقی عەظیمی» هینــا

خولقی عەظیمی ئەتو قورئانی خاوەن شـــکۆە
بو شەوکەت‌و شانی تو قورئان بووە بە پــەنا

بــە نووری ئیمانی تو ، بـــە عیلم‌و عیرفانی تو
بەوەعزو تبیــانی تو ئەم‌چەرخە کەوتــە صەدا

بەحیلمو ئیحسانی تو ، بــە عەفوی ئاسانی تو
بەرەحمو ویجدانی تو بوت‌بو بەشـــەر بە فیدا

ئەوەنەبوو تا دەســـەر لە کافری بەدئەثـــەر
بو کوشتنت هاتــەبەر بەنی‌یـــەتی ئیعتیدا

کە لی‌ی ئەبووی باخەبەر بی زەجرو بی دەردی‌سەر
رووت‌کردە صەرفی نەظەر لە کینەوو لــە عیدا

صاحیبی سەیفو قەلـــەم ، طالبی عیلموعەلەم
عاجز لە ئیشو ئەلـــەم مەر بو جەزای ئیعتیدا

سەرگەردی هیممەتی تو ئاصەف کورری بەرخیا
شاگردی حیکمەتی تو (لوقمان) بەچەن ئیعتینا

لەبەر مەلاحەتی تو (یووسف) قەلەم‌برر بەدەس
لەبەر فەصاحەتی تو (سەحبان) عەلەم دەرفەنا

بو سەعدی طالیعی‌تو (زوهرە) بەدل موشتەری
لە نووری لامیعی تو شـــەمسو قەلەم دەرپەنا

«کاف» بوکیفایەتی تو ، «هی» بو هیدایەتی تو
«یا» بو جەماعــەتی تو رەمزی خیطابــەو نیــدا

«عـــەین» بو عینایەتی تو عیلمو عــەدالەتی تو
«صاد» بو صەداقەتی تو ، رەمزە لــەبو ئیهتیدا

«طاها»و «طاسیم»ی تو «طاسین»و «یاسین»ی تو
راستە بە ناسینی تو بەشــەر ئەگا بــە خودا

بو«صـــاد»ی چاوانی تو ، کومـــــەلی لاوانی تو
وەك قوچی قوربانی تو خویان ئــەکرد بــەفیدا

به «قاف»ی قورئانی تو ، به «صاف»ی عیرفانی تو
چەن موخلیسی شانی تو چونە ریزەی شـوهەدا

بە«نونی» نامەی کەرەم بو عەرەبو بو عەجـەم
چەن سەروەری موحتەرەم چوونە گەلی سوعەدا

کە طەلعەتت کەوتە دەر ، لەشەرمی رووی تو قەمەر
شەق‌بوو لە خوارو لەسەر لەوجیگە کەوتە پـەنا

تەنیا نەوەك هەر قەمەر ئەم عالەمە سەربەسەر
خادم‌و دەس‌بەکەمــەر دەم‌بەسوپاس‌و ثــەنا

سوجدەبەرە داری دەر ، لە سووسەمار دی‌خەبەر
ئاهوو شــکاتی خەتەر دینیتە لات بو پــەنا

لەبـەر فیراقی ئەتو کولەکـە هاتـە ستۆە
حەقیــە بــەبی گفتوگو بیتــەفغان‌و زەنا

چون سیرری حـەق سـاری‌یە لە جامیدو نامی‌یا
لە جینن‌و ئادەمی‌یا ، لە جەوهەری مـەعدەنا

ئەتوی مەسیحا نەفەس کەلیمی طوری قەبـەس
عەصــای ئەتو عیلمە بەس ، واللهُ أَوْرَثَنا

## سکالایەك لای فەخری عالەم (ص)

ئــەی گولی باغی دلـم ! توگول‌و من بولبولم
لەبو سـوروری دلم خـەندە بکە بـە صــەفا

با بەس‌بی ئەسرینی چەم ، وکوو گولی نم‌بەدەم
با بەس‌بی نالین‌و غەم لـەداغ‌و دەردی جـەفا

ئەی شاهی بەیتو حەرەم ! فەرموو بە شیوەی کەرەم
با گوشـــەچاوی بخـــەم بو خادمی بـــەوەفا

تا بــە بەلاغەو ئــــەدەب وەك بولبولی بەتەرەب
بەنەزمو نەغمەی عەجـەب بیمە ثەنای موصطەفا

بەسۆزو ســـــەودایە دڵبە زەوقو ئینشایە دڵ
بو تویە شەیدایەدڵ ئـــەروا بە شەش تـــەرەفا

«بوردی‌یە» یا «کوردی‌یە» هەرشەوقی ئەحمەدی‌یە
عەشـــقی موحەمـــەدی‌یە لـــي ولمِن ســــــلفا

بەحریکە بی بیخوپەی ، چەن کەعبو حەسسانی حەی
«جامی» بەچەن جامی مـەی مِنْ عینـەِ اغتَـرفا

هەرچی هـەبوو ئەصفیا لــە ئــەنبیاو ئـەولیا
موقـــەررەبی کیبریــــاء لــە جامعـــەی عورەفاء

ئیحسانو جوودی هەمو سیماو سوجودی هەموو
نوری شوهوودی هەموو مِنْ حَضْرَةَ المصطفی

مــەقامی مەحموودی تو ، جیگەی فغانەو پـــەنا
لـــە حەوزی مەورووودی تو گرد ئەبنەوە ئومـــەنا

صوورەتی مەحبووبی تو ، سیرەتی مەرغووبی تو
بو دڵی مەحســــووبی تو نوریکە ناگری پــــەنا

نیعمەتی مەشهوودی تو ، مەرحەمەتو جوودی تو
بو قـــەومی مەســـعوودی تو عَمَّ ودامَ لَنا

بەمادده ئینسانی تو ، مـــەرکەزی ئیحسانی تو
ئەمما مەلەکسانی تو لە ئەوجی قودسی ســــەنا

روحٌ عَلَيّ عَرشِـــه يُوجِبُ اجلالَنــا
شَـــخصٌ عَلَى فرشِـــه يجلبُ اقبالَنــا

ئەی پادشاهی حــەرەم خاوەنی خوانی کـــەرەم
ساکت بەبی «لا» و «نەعە»م هاتوومە سایەو پەنا

دەخیل بەوینەی عەرەب ئەی پایەبەرزی حەسەب
ویڵم نەکەی بیدەلیل لە دەشتی صاحیب تــەما

منخادمو ، شاهی تو ، ئەمیری جــەمجاهی تو
حەیفە لــەبو جاهی تو بەندەت لەناو ماتـــەما

ئەســـیری دنیایـــە دل لەگیژی دەریایـە دل
با رەحمی تو بیتەکول ئەی کانی فــەیزی سەما

تووو مەرتەبەی سەروەری تووو مەنقەبەی رەهبەری
نەسیمی بو عەنبـــەریی با بیتەدل لـــەمدەما

جا با بە ئیحسانی تو ، دوو دەستی دەربانی تو
بگەن بـــە دامانی تو دەرچم لــە چالی غـــەما

یا شمسَ نور الضحا ، یا بدر لیل الدُجا
من بالهـــوى فَلَجا لبـابكم التجـــا

وجاثيـاً قـد اَتَـى مـــن اجل نيل العطـــا
فجُدْ لِمَن قد أتـى يا خيرَ مَن يُرتجى

بو خادمی حەزرەتت ، ســایەی لیوای رەحمەتت
پایەیــە بو ئیهتیدا ، مایەیـــە بو ریی نـەجا

لـــە حالی بیحاصـــلم بەســـراوە دەرگای دلم
ســا حەل بکە موشکیلم وافتَحْ لَنَا مخرجـــاً

هاتوومه ئاسانەکەت بو فەیزی ئیحسانەکەت
با هەوری نەیسانەکەت برژینی سەیلی رەجا
ئاوی حەیاتم ئەوی ، سایەو پەناتم ئەوی
« نوورو نەجاتم » ئەوی ، یا املي للنجاة

شوکری خودا بیخەفا دل مولهەمە بە صەفا
لای حەزرەتی موصطەفا قەبوولە هیواو رەجا
دوولیوی دەربانی ئەو ، لە عەینی ئیحسانی ئەو
شەربەت ئەبا روژوشەو ، نەك هەردەمی ئیلتیجاء

## پاررانەوە لە خوای تەعالا

یا ربّي ، یا راحمي ، یا خالقي ، منعمي
یا صاحب الكرمِ ، یا مَن بهِ یُلتجی
یا رافعَ السقمِ ، یا دافعَ الالَمِ
باسمكَ الاعظمِ الوذُ حين الرجاء

وكافّة الانبياء ، السادة الأوفياء
وسائر الاصفياءَ مَن في الصفا ولَجا
لا سيّما المصطفى اشرف اهل الوفا
مَن للورى بُعثا ، مَن في العُلا عرَجا

والـه المحترم والصحب سُحْبِ الكرم
وكلِ اهل الحرم ، ومَن به يُرتَجى

واهلِ علم الاثر للدينِ اذ يستطر
واهل ذكر السحَر ، مَن بالوفا ادْلَجَا
ارحم بنا ربّنا ، فانّنا في العنا
وما الَمَّ بنا مِن وُسعنا خرَجا

واكشــف لَنا رَبّنــا كرباً اَحاط بنــا
والطف بِنا ربَّنا ، واجعل لنا مَخرجَا

واشــرح لنا صدرنا ، يَسّر لنا امرنا
واختــم لنــا عمرَنا برحمــة ونجــاة

من خوم به شيوەی وەفا ئيقرار ئەكەم بی خــەفا
به بەردی جورمو جەفا جامی صەفاكەم شــــكا
بــــەلام كه دل هاتەكول ، داوينه پرربوو لەگول
لــه عــەرەقی شـــەرمی دل زەردەگولی لی‌تكا

كوورەی كەرەم ديتەدەم گوناه ئــەبا زورو كەم
لای رەبيی بەيتو حەرەم دی ئەمری عەفوی خەتا
رەحمی خودا لەمدەما ئەرژی لــه ئەوجی ســەما
اِن عَمَّ منّــا الخطا ، قد عَمَّ منهُ العطــا

بريژه رەحمـــەت خــودا بی‌ئەوەڵو ئينتيهــا
سەر سەروەری ئەنبياء سەررەهبەری ئەصفياء
سەر ئالو ئەصحابی ئەو ، ئەتباعو ئەحبابی ئەو
طــالبی ئادابی ئــەو له ئــەتقياو ئــەوليا

تا بەرقی نووری سەما ئەرژی بەســـەر عالەما
تا له بــەنی‌ئادەما طــالب هەيــه بو ضـــياء
تا (نامی)يه(١) شـــاخی‌گول لەديبەری بــەرچيا
تا ســـامی‌يه باغی دل له سيبەری ئەصــفياء

**مانگی رەمەزان ـ ســالی ١٣٧٥ی كوچی**
**تەكيەی تالەبانی ـ له شاری كەركووك**

---

(١) دانەركەليمەی « نامی » بەكارهيناوه بو نازناو ·

## بسم الله الرحمن الرحيم

حەمدو ثەنای عــام بو خودای عــەلیم
رەهنومای بەشــەر بو عیلمو تەعلیم

برژی بارانی صــــەلاتو ســـــەلام
بەسەر روحی شای میللەتی ئیسلام

ئیسمەن موحەممەد ، رەسمەن مومەججەد
ئەکمەلو ئەجمەل ، ئەشرەفو ئەمجەد

هەم لە سەر ئالو صــەحبو تابیعین
خــــودا رازی بی لی‌یــان ئەجمەعین

پاش ئەمە ئــەڵی بە صیدقو تەسلیم
چاوەڕی‌ی فــەیضو تــەوفیقی علیــم

(عەبدولکەریم) ناو طالبـــی حیکمەت
مائل بــە نەشری ئەسبابی رەحمەت :

مـــەولانا ( خضــر ) شیخی رووواری
روتبـــەی عالی‌کا حــەزرەتی بــاری

لەســەر زوبانی هــەورامی عامـــە
نەظمی فەرموو بوو یەك (دەولەت‌نامە)

چونکــە نەظمێکی بــە ئینتیظام بوو
لــەبو خاص‌وعام نەفعی تــەمام بوو

لەهجەکەم گۆڕی سەهلو بی‌عیللەت
تا نەفعی بگا بە هــەموو میللـــەت

تەرتیبم گـــۆرری بۆ ئاســـانی یاد
هەندی جیم کەم کرد ، هەندێکی زیاد

چونکـــە ئیقبـــالم لەمـــە مەرامـــە
نـــاوم بۆ دانا بـــە ( ئیقبال‌نامە )

ئومیدم وایـــە بۆ گـــەورەو منـــال
ببی بـــە مایەی عیزەت‌و ئیقبـــال

تەرتیبی وایە : یـــەك ( موقەدیمە )
دوازدە ( باب )و ئەمجار ( خاتیمـــە )

## ( موقەدیمە )

( بسم‌الله ) ئـــەلیم بە موقـــەدیمە
مەقصوود لـــە کتیب هـــەتا خاتیمە

بزانن خودای حـــەکیم‌و وەهـــاب
دای‌مەزرانووە دنیا بـــە ئەســـباب

دنیای بەش‌بەش کرد بە چەن تەقسیمی
بەهـــەر قیسمیکی ئـــەلین ئیقلیمی

لەهـــەر ئیقلیمی دایـنـــا میللـــەتی
بۆ هـــەر میللەتی یـــەك طەبیعـــەتی

هەرچـــەن مەوالید هەیـــە لـــە دنیـــا
حـــەیوان‌و مـــەعدەن ، یا جنسی گیـــا

دای‌بـــە هەریەکی هـــەندی لەئاثار
بۆ دەلیل لەســـەر قودرەتی قەهھار :

ئینسانی رەشە، یەکی خوش روخسار،
گیایی دەوایە ، گیایی ئازار ،

یاقووت بو ثەروەت، طەلا بو عیززەت،
ئەلماس بو دەفعی بەرقی بە هەیبەت،

بەمەدحو ثەنا دل ئەبی خوش حال ،
بەذەمو جەفا عاجزو بەدحال

هەردوویان قسەن : یەعنی هەوای دەم
ئەوەلیان نۆشە ، ئەمیان ئیشو غەم

کە شاخی بزن بین بکا لە خاك
لیی پەیدا ئەبی ماریکی ناپاك

زوو پەیدا ئەبی لە خشتی نمدار
دووپشکی چزدار ، بە زەهرو ئازار

چەن ئاداب هەیە بەدل ئەدەن نوور ،
چەنی عومرو مال پیی ئەبی مەوفوور !

هەندی کار هەیە عومرت ئەکا کەم
هەندی کار شەررەو ، مەینەتەو ، ماتەم

هەندی بیرو هوش پیی ئەبی زیاد
هەندی بیرو هوش پیی ئەبی بەرباد !

هەندی کار مایەی شانو عیززەتە
هەندیکیش کوسپەو ، مایەی نوشوستە

هەندی بەکارە بو بینایی چاو
هەندی هیزی چاو ئەکا ناتەواو

والحاصل سەبەب لەگەل موسەبەب
رەبطیکیان هەیە شەرعیو مورەتتەب

ئـــەم عالەمیشــە جیگای ئەسبابە
مەزرەعـــەی رۆژی خیرو عیقابــە

کەواتــە باشــە بە قەدەر طاقـــەت
ئینسان بە ئەسباب ببیێ مەعریفەت :

بزانـــی کامـــە مایەی ثەوابـــە
کامـە باعیثی شـــەررو عیقابـــە

تا لەمیان لاداو ، رووبکاتە ئـــەولا
ببی بە جێگـەی ئـەلطافی مـــەولا

## بابی یەکەم باسی ئەوشتانە ئەکات
## کە دل روشن ئەکەن

ئـەو فەرمانانەی روشن ئەکەن دل
یەکەم صەلەواتدان لە شاهی رسل (د٠خ)

یادو ذیکری حـەق چرای دەروونــە
ژیر ئاگـادارە لـەمچەنو چوونـــە

ئایاتی قورئــان ســەرچاوەی نوورە
خوێندنی بۆ دڵ مایـــەی ســروورە
زانینی مـەعنای نوور لەسەر نوورە
بی نوورە هەرکەس لە مەعنای دوورە

دل روشـــن ئـەکا تەقواو عیبـادەت
نویژی چیشتەنگاو ، نویژی جەماعەت

نویژی نیوەشەو ، بیداریی سەحەر
ئەبنـــە رووناکی بۆ دلی بەشـــەر

ریزو گوی‌گرتن لــــە دایكو بـــاب
دل روشن ئەکەن بی حەدو حیســـاب

هاوری‌یی چاکـــان روشـــنی دلـــە
دەوای ژەنگی دل شــــیخی کاملـــە

دل روشـــن ئـــەبی وەکو ئاییـنـــە
مادام تیا نــەبی بەخیلی‌و کینـــە

کەم‌خوری‌و ، پاکی‌و ، حەلالی طەعام
دل روشن ئەکەن، بی‌گەرد، وەکوو جام

زورخوری‌و پیسی‌و حەرامی طــەعام
دل دوور ئەخەنۆ لە فەیض‌و ئــەنعام

بوکـــەم مـــەجالان صـــەفا محالـــە
فەراغــەت مایـــەی عەقل‌و کەمالــە

## بابی دووەم باسی ئەوشتانە ئەکات کە ئەبنە هوی دریژی‌عومر

عومرت زور ئەکا ، ئەی نووری بەصەر
تەماشای بالاو روخساری دولبـــەر ،

دەنگ‌و رەنگی باش، خەطو ناوی خۆش
نەزۆرو نەکەم شادی‌ی‌و عەیش‌و نوش
بینی خوشی کچ مەنکوحەی حـــەلال
بەعەقل‌و کەمال ، بالا وەك شمشـــال

کەلامی هەیە عـــەرەبیو مەرغـــووب
« شـــفاء القلوب لقـــاء المحبـــوب »

هەیوانو خانووی گوشـــادو عالـــی
مەخصووص مـــەنزلی بەرەچاو خـــالی

کیوانی بولـــەند وەکو « دەماوەند »
وەك تەختی «شاهو»و «ئەلبورز»و «ئەلوەند»

عومری ســـاکنیان دریـــژە داییـــم
رەنگیان ســـالمەو ، بەدەنیان قاییم

پیاوەتیو چاکـــە لا ئـــەبا بـــەلا
زیاد ئەکا عومر بـــە ئـــەمری خـــودا

عومرت زیاد ئـــەکا یومنی حەسەنات
وەك کـــەمی ئەکا شوومی ســـەیئات

نافیعـــە بو عومر ، رافیعـــە بو ئیش
بەجیهینانی صیلەی رەحمـــی خویش

بو خوشیی دلیان زور بکە تـــەلاش
بە دەهەندەیی ، یا بە قســـەی باش

قاوەلتیو شیوت بکە بە تـــەرتیب
ئەو پیش نیوەرو، ئەم لە پیش مەغریب

شیوی نیوەشەو ، قاوەلتی درەنگ
عومرو صیحەتت لەسەر ئەکەن تەنگ

شافعی فـــەرمووی : « العلم علمـــان
علـــم الادیـــان ، وعلم الابـــدان »

لـەبو ساغی دین عیلمی ئەدیانـە
بو سـاغی بەدەن عیلمی ئـەبدانە

بناغـەی سـاغیی کـەمخوراکی‌یە
زورخوریی مایـەی دەردناکی‌یە

بو مانـی ژیان « کلوا واشـربوا »
لە بوو لەش‌ساغی « ولا تسـرفوا! »

خـەوی موعتەدیل : نە زۆرو نە کـەم
دەوامە بو گیان ، دەوایە بو غـەم

مروی بـە ئـەدەب عومری زیـادە
بی‌شەرمو ئـەدەب عومری بـەربادە

ئـەدەب لە ئـەهلی عەقلو عیلمو دین
مایەی دریژیی عومرە بـە یـەقین

حەدیثە : « هەرکەس حورمەتی پیرێ
بگر ، بەپیریی حورمەت ئـەگیرێ »

صـەلاوات مایـەی عومرو دەولەتە
چونکە میفتاحی حوبی حەزرەتە (د٠خ)

عومـری دریـژە حاکمی عـادل
رەحـەتی روحـە ئوستادی کامل

جار جار تەماشای گولی « هەرمەڵە »[(١)]
باعثی شـادیی‌و فـەرەحی دلـە

---

(١) هەرمەڵە = هیرۆ ٠

شکار ، جاربەجار ، مایەی شادیی‌یە
صــەیادیی دایــیــم نامورادیـیــە

یاری بە شەترنج شادی‌یە ، کەم‌کەم ،
زوری ســەبەبی نەگبەتــەو ماتــەم

ئیش‌کردن بو لــەش دەرمانی دەردە
بەدەنی کاســب وەك پولاو بــــەردە

هەرکەس بی‌کارە موبتــەلای دەردە
ئەغلــەب بازاریی رەنگیــان زەردە

ســەفەری کوتاه لەگــەل ســواریی
فەرەحی روحەو ، دەوای غــەمباریی

وەختی بو ســــەفەر رویشتیتە دەر
بکە دوورکات ســونەتی ســــەفەر

ئەمجار بخوینە سوورەتی «قورەیش»
لەوسەفەرەدا ئەبی صاحیب عەیش

عەصـــا لە بو پیر مایەی ئیقبالـــە
چاکتر لـــە « میلۆ » بادامی تالـــە

ئینســانی بی‌دەنگ عومــری زیــادە
هەرزەگو عومری خــەیلی بەربادە

زیان دریژیی شەررە بو ئینســـان
تلفُ الانســان طرف اللســـان

هەرکەس زبانی مەحفووظەو مەخزوون
ئەوکەسە دلی قــەت نابی مــەحزوون

نەقشبەندی‌یان حەپس ئەکەن نەفەس
هـەتا عومریان نـەروا بـە عەبەس

زبانت یەکە ، گوێچکـــەت دوانـــە
یـانی : یـــەك‌بلی‌و ، دوان بزانـــە

## بابی سی‌یەم باسی ئەوانە دەکات
## کەعومر کورت دەکـەن

بـوت بـەیان ئەکەم جوان‌و تەمییز
هەرچی زیانە بو عومری عـــەزیز :

یەکەم فکرو غـەم ، پەریشـانی دل
هەرکەس غەمبار بی زوو دەرواتە گل،

ئارەزووو طـەماع بو مالی کەسـان
بەخیلی‌و حەسەد ، وەکوو ناکەسـان

توورەیی زیاد عومر ئـەکا بـەرباد
هـەم خەجالەت بوون لە بەینی عیباد

داری نەسووتی ، چرایـە نەگـرری
میداد نەنووسـی ، تیغی نـەبرری ·

وولاغی کـەمپی ، رەفیقی‌ی نادان ،
ئیحتیاجی‌ی مەرد بو لای نامەردان ،

مەحکوومی‌ی لەدەس حاکمی جەببار ،
لە ناو ناکەسان ببی گوروفتـــار ،

قـەرزاری پارەی پیاوی ناپەســەند
مەخصووص ئینسانی تازە دەولەمەند ،

دلوپــەی خانوو ، کەوشی بــە ئازار
بەدخولقی ژنان مەخصوص بەدکردار ،

بی کەوشی‌ی چاکە ، نەك پیلاوی تەنگ
بێ‌ماڵی چاکە ، نــەك ماڵی پڕردەنگ

رەنگی ترش‌و تاڵ، طەعنەو قسەی سەرد
لــە دلا دەردە ، لە چاوانا بـــــەرد

خەوف‌و فەرەحی لــە میزان زیـــاد
وەك سەیری مردوو عومر ئەکەن بەرباد

لــەمانە بــەدتر پیری‌و ئیحتیـــاج
مــردن چاکترە بو پیری موحتـــاج !

بـــەتایبەتی کەسـیکی شـــەریف
لەچەرخی گەردون کەوتبی‌و زەعیف

جیمـــاعی زیـاد وەکوو پاســـاری
کەم‌عومری دینی هـــەم دەردەداری

چوونەلای حائیض ، هەرچەن‌حەرامە ،
مایەی نەخۆشی‌ی‌و کزی‌ی ئـــەندامە

خوینی ئــەو ئەبی بە نوطفە واصــل
دەردی خـــراپی لی‌ئـەبی حاصـــل

گوشتی حـــەیوانی لات‌و دەردەدار
مــەخو ؛ باعیشـــە بو دەردو ئــازار

پارووی‌ــەك زورباش نەیبرری ددان
فریی‌دە مــەیخو ؛ ئەبی بە سـنـنان

ددان گــەوهەره لایدە لـــە رەقیی
پیی‌مەشکینە یەرد بە کەللەشەقیی

لەمســـی ســـوورا خواردن زەرەرە
ســـپی‌کراو بی تـــوزی چاكترە

بەدەنت مەگرە لـــە قەزای حاجـەت
زوو بەردە گمیز ؛ نـەبێ بە عیللەت

لای «ئیبن‌وحەجەر» ، هەم قەولی «ئەنوار»
حەرامە هەنگوین بو شەخسی تادار ؛

گرانــەتادار هـــــەنگوین بچیــژی
مەرخوا نـەیکا ئـەرنا ئـــەیکوژی

بو تەسکینی تا خەســـتەو ماس‌و دو
بـــە لوطفی خـــودا دەوایــە بو تو

لە هی هەنگوینا ئەگەر ئەکەی باس :
فەرموویە : « فیە شـــفاء للناس » ؟

بو جوابی تو بـــە صـــــەبرو قـــەرار
ئــــەلیم شــفایە بو بەعضـــی ئازار

لە بو ئلشی ســك مەخصوص شفایە
بو دەفعی بـــەلغەم ئـــەعلا دەوایـــە

بو چـــەن مەعجوونی روكنی وافیـــە
بو مەعنای ئایـــەت ئەمە کافی‌یـــە

چونکە فەرموویە : تیاهەیە شـــیفا ،
نەیفەرموو بو گشت عیللەت‌و جـــەفا

بەدیی‌و بەدناویی مەکــە گەوارا ؛
« ولا یــــزیدُ اِلاّ تبـــــارا »

## بابی چوارەم قسە نەوشتانە دەکات
## کە باعثی نەگبەتین

بزانــە هەرکەس ئــەهلی عیصــیانە
لــە هەردوو دنیــا کاری نوقصــانە

بە فیسق‌و فجــوور بزانــە مەعلووم
لــە دەوڵەت ئەبی بێبەش‌و مەحرووم

گەر ئەڵی زور کەس صاحیب دەولەتە
هەم ئەهلی فیسق‌و دروو غەیبەتــە ؟

ئــــەڵیم : ئەومالــە مالی دەمدەمــــە
بی عاقیبەتەو روو لـــە عەدەمــــە

یاخو ئەوکەســە بەوهەموو مالــــە
داییم مەلوولــەو ، حالی بەدحالــــە

بەهەر مالیکیش مەلوول ببی حـــال
ئەوە نەگبــەتە ، نەك خیرو ئیقبـــال

کوی ئەکاتەوە بە هــەزار زەحمــەت
بەجێشی دێلی بــەئاخو حەســـــرەت

« نالە » ، ئەگەرچی صاحیب حەیوانە
چون بو خوی نابی مەعلووم شــوانە

نەگبــەتیی زورە « تارك الصــلاة »
لە هــەر مالی بی پرره لــە ظولمــات

هەرکـــەسی نـەیدا زەکاتی مـاڵی
« نعــوذ باللّه » لـە بـەدیی حاڵی
نـــەدانی زەکات مـەنعی بارانـــە
بـە « زینا » وولات چوڵو ویرانـــە
هەرکەسی نەگری روژووی رەمەزان
دوژمنی دینـــەو هاوورریی شەیتان
ئەگەر حەج نەکا خاوەنی سـەرووەت
نگینو ماڵی ئـــەبی بـە نەگبـــەت
دروو هــەرزەییو یارییی ناشـیرین
نەگبـــەتین ، برا ، بو دنیاو بو دین
دەخیلە مـەخۆ ، بە درو ، قەســـەم
ماڵ ویران ئەبی ، بروا ئـەبی کـەم
کەواتە لـــەبو شـەخصی موسـلمان
گوناه باعیثە بو شەررو نوقصـــان
مەڵی : وانییە ؛ خۆ شـەخصی کافر
بـەدەنی سـاغەو سـامانی زیاتر
دنیا زیندانـــە لـە بو موســـولمان
بەهەشتە لـە بو بیدینو ئیمـــان
خەو ، نەزۆر نەکەم ، مایەی صیحەتە
زوری هـەوینی شـەررو نەگبـەتە
خـــەوی سبەینی تا خۆرئەکـــەوی
هەرکەســـی بیکا نەگبەتیی ئـەوی

« قل لو كان البحر » هـەتا « احـدا »
بەشـەو بیخوینە لە کاتی خـەودا

لە وادەی دلخواز ئـەبی خەبـەردار
سیرری قورئانـە ؛ بتبی ئیعتیبـار

لـە نیوەررودا « قەیلوولە » چاکـە
دوای عەسران نووستن مایەی هیلاکە

سـەرت لە دەرگاو ، بەدەنت لـەمال
مەنوو ؛ باعیثە بو شـەررو وەبـال

لە خەو دامەنی دەس لە ژیری سـەر
مەر بو ئیتیباع سەیدی سەروەر (ص)

بە قەصدی سوننەت شەرریش ئیحسانە
ئـەمە ئەزانی هەرکەس ئینسـانە

مەنووە لە مزگەوت بـەبی زەوورەت
تفی تیمەخـە ئەدبارەو نەگبـەت

لـە قەبرستاندا نووستن نەگبەتـە
نووستن لـە حەممام فەنای دەولەتە

هەندیکت لە خور ، هەندیك لە سیبەر
مەنووە ؛ بوت ئەبی بە دەردو زەرەر

لە سـەرەریدا نووستن زەحمەتـە
کاتی لەشپیسی خواردن نەگبـەتە

لەگەل لەشپیسی خوێندنی قورئـان
بیجگە لە گوناە ، نەگبەتەو نوقصان

رویشتن لــــه بو مزگــەوت‌و بازار
به لەشی پیســی‌ی نەگبەتەو ئــەدبار
ئەگەر حەز ئەکەی نەبینی موشــکیل
هەرگیز مەشوره دەس بــه ئاووگل
دەس‌نویژ مــەگره له ئەدەب‌خانــــه
بو مال‌وحالت شــــەررو نوقصـــانه
له سەرەری‌دا بــەول‌و نەجاســـــەت
هــەم له مەجلیســـا زیانەو نەگبــەت
لەژیری دارا ، مەخصووص بەثەمەر ،
هەم روو له قیبله نەگبەتــەو زەرەر
تەماشای پیسی مایــەی خەســــاره
لەسەر نەجاســەت قسه ئـــەدباره
بو عەورەتی خوت ، یاعەورەتی غەیر
مەرروانه ؛ شەرره، شەرر نابی بەخەیر
هــەرگیز مەرروانه لــه بو نامەحرەم
خەفەتــه بو دل ، دینیش ئەکاکــەم
چەن‌کەسی شیت‌کرد مــەراقی نەظەر
چەندی موبتەلا بــه دەردی جیگەر !!
بویه فەرموویه حــەزرەتی رەئیس :
نەظـــەر تیریکه لـــه تیری ئیبلیس
به پال‌کەوتنو ، یا بـــه راوەســـتان
نەگبەته ، هــەرگیز مــەخو ئاوونان

نان له هەژاران ، دەروزەکـــەران ،
وەرمەکره ؛ مالت پی‌ی ئـەبی ویران

تیکه لــــه دەمدا بیجـــاوه جـــوان
بابۆڵـــەی مەکـــه به وینـــەی نادان

له تەنشتەوه ، یا لــه ســـــەری ران
یا له دوورەوه قـــەت دامـــەنی نان

له بەردەمتدا بەقـــەدرو حورمـــــەت
دای‌بنی‌و بیخـــوو بـــه ئیستیراحـــەت

نان‌مەخه بـــەرپی ، شەررو نەگبەته
ئیکرامی طـــــەعام مایەی ســـــەروەته

بـــەددان لـــەنان مـــــەبرره تیکـــــه
هەرزەکار مەبه ، قـــەت مەکه فییکه

ئاو مەخورەوه لـــه گوزەی شــــــکاو
مەخوو مەخورو لەکاســـەی بەســــــراو

بەکارمەهینه شــــانەی ژنانـــــه ،
شـــانەی شەریکی‌ی‌و شکستەدانــه

ریشت بە ووشکی مەکه بەشـــــانه
شـــانەی ئەمانەت نەگبەت نیشـــانه

مەگره بــــــه ددان سمیل‌و ریشــــــت
بوچی بـــــەتالی برو بو ئیشــــــت !

هـــەرگیز ناخوونت مـــەگره به ددان
ناخوونت مـــــەده لـــــــه بیخی ددان

ناخوونت مـەگرە لە چوارشـــەممە
باشـــە لە دوای عەصری پێنجشەممە

کە ناخوونتکرد دەس بشو جـوان
بەخلیلـــەی مورد ماژنـــە ددان(١)

طەعامی بەدبو دوور لە رەحمەتـــە
بو شـــەوو روژی جومعە زەحمەتـە

دوور بە لە هەرکەس هەرزەکەلامـە
مەخـــەرە ژێرپێ شـــاڵو عەمامـــە

قـەط مەدوورەوە لیباس لـــەبەردا
با بێئەوزاعیت نەیـــە بەســـەردا

بـــە دانیشـــتنو دەرپێ بکـــەپێ
میزەر بـــە پێوە ؛ خێرت ئـــەگاتێ

قەط بە داوینە یا بەگوشـــەی جل
رووی خوت مەسررە ، فەقرت دێتەمل

لەسەر هەردو پێت ئەگەر دانیشـــی
بەقنجۆ ، ئەلیبت موشتەرێی ئیشی

بە دەستەوئەژنو دانیشتن شـــەررە
سەر لەسەری ران مەنێ ؛ بێفەررە !

لە خانووی تاریك تـــەنیا دانیشـــی
دیارە بەتەمای ئێشو ئەندیشـــی !

---

(١) ماژنەددان : واتەچیلکەیووردی داری مۆرد مەکە بـە بەینی دندانتـا .

به ئارام بررو ، روژه یا شـــەوە ،
خوت‌لادە لــە رری ، لە خولەکەوە

دەس‌مەبــە دوا وەختی حـــەرەکەت
لەهیچ حەیوانی قەط مەکە لەعنــەت

قەط مەسووتینە گەلای پیازوســیر
پیش‌مەکــەوە لـــە ماموســتاو پیر

لــە بەینی‌ران‌و گاگــەل‌و قـــەطار
ئەگــــەر رابووری دەبینی ئــازار

بـــەناو خەلـــەدا گوزەر ئــازارە
مەخصووص خەلەیــە مالی هـــەژارە

لەسەر ئاوی‌پاك قــەط دامەکــە تف
مەکوژێنەوە چرای شـــەو بـــە پف

قامیشی مەعقوود یـــەعنی گری‌دار
قەت‌پی‌ی مەنووسە ؛ نەگبەتەو ئەدبار

مەخەژیری پی کاغـــەزو قەلـــەم
خەوش‌وخال مەکە لەناومال‌دا جـــەم

قــەت تــەفرە مــەدە فەرمانی خیرات
تــاخیری خیرات ئــەبی بـــە ئافات

عەجەلــە مەکــە لــەکارا ، دەخیل !
مەگــەر لە خیرا ؛ « في الخير تعجيل »

ئیمساك نەگبەتەو ، ئیسراف مەذمومە
ئیقتیصاد چاکە ؛ خــەیری مەعلوومە

ئەگەر لە دەخلت زیاتر بی خـەرجت
بـەچاو ئەبینی زەحمـەتو رەنجت

مـەدە لە هەتیو مەگـەر بۆ ئـەدەب
لەگەل گەورەدا مەکە گالتەو گـەپ

یانـەی « عنکبوت » جولاییکـەرە
لایبـە لـەمالا بـەدو بیفـەررە

هـەر تەویلەیە تیابی عەنکەبووت
وولاغی لـەرە ، لاتو نامـەزبووت

خانوو نـەیمالی ، یا شـەو بیمالی
ئـەبی بـەمایەی پەریشـان حالی

چیلکە مەتاشـە ؛ کاری بەتالـە
کوترچیو صـەیاد داییم رەجالـە

هەرگیز دوعای شەرر مەکە لە ئەولاد
ئەگـەر ئەتـەوی بمینی دلشـاد

دایكو باوکی خوت بانگ مەکە بەناو
تا ریسـوا نەبی سـووكو ناتـەواو

باویشك مـەدە رووبەرووی کەسـی
یا دەمت بگرە بـەپشتی دەسـی

بەچاوی سووکی مەروانـە بوکـەس
مەبە بەفیتنە قسـەی کەس بوکەس

پەنامـەکی خوت مەبـە بو کەسـان
سـرر وەکو سەرە مەیدە بە هەرزان

رامەگرە لەماڵ نەسەگ، نە سوورەت
ئیللا سەگی پاس لەبەر زەروورەت

لەدەوری تەرمو لەسەر مەقبەرە
واتەی دنیایی گەلی زەرەرە

کاتی ئەخوینری حەدیثو قورئان
گوی‌بگرە ؛ چونکە ئارامن بوگیان

قسەی پررو پووچ ، زەمزەمەو صەدا
نەگبەتە ، مەخصووص لە یانەی خودا

مزگەوتی ئیسلام خانەی خودایە
شوینی توبەو یاد ، نزاو دوعایە

پررمەکەرەوە هەر ئاوی پاکە
دەستت دامەنی لە ژیر چەناکە

خاکی گوررستان مەیینە بو ماڵ
گەر پادشا بی ئەبی بە حەمماڵ

« وفقنا الله على الآداب
أعني آداب أهل الصواب »

## بابی پینجەم قسە لەوشتانە ئەکا کە بیرو هۆشی مرۆڤ زیاد ئەکەن

پشت بەخوای گەورە بوت ئەکەم بەیان :
هەرچی زیادئەکا حافیظەی ئینسان

ئەعلای وەسـیلە سـەعییکە داییم
حافیظە بە سەعی زور ئـەبی قاییم

کرداری چاکـە نوێژی نیوەشـەو
ئەدا بەذیهنت شەعشەعەو پرتـەو

خوێندنی قورئان، مەخصووص بەنەظەر
چاکترە لـەوەی بیخوینی لەبـەر

گەر لـەبی حیفظی خەیلی ئەترسی
بکە بـە ویردت ئایەتولکورسی

دوعای حافیظـە بـەبی ئیرتیـاب
لە « ئیحیا »دا هـەن لە بابی ئاداب

روژانی جومعە بخوینـە صـەلەوات
صەلەوات دەبیتە هو لەبو خـەیرات

بەخۆشویستنی رەسوولی ئەکرەم (ص)
ئامـانجی خیرت بۆدیتەبەرهـەم

تەوبە لەگوناه ، تـەرکی مەعاصـی
بەقوووەت ئـەکەن حافیظـەی ناسی

چونکا حیفظو ذیهن نووری خودایـە
نایبتـە دلی بـە شـەرر سیایـە

ئـەم ئادابانـە لـەبو ئیسـلامە
ئادابی ئیسـلام مایـەی مەرامـە

لـە بوو حافیظە سـیواك دەوایـە
بەکاری بێنـە ؛ سـوودی تیایـە

خاوینیی لـەش و پۆشـاك و خۆراك
پەیوەندیی بەهێز لەگەڵ پیاوی چاك

بـەخواردن و خـەوتن بەقـەد حـاڵ
بـیرو زیرەكیت دەگاتـە كـــەماڵ

عومرت بـە فیڕو مـەدە بـــەتاڵان
مەبە بەهاوڕێی هەرزەو بـەتاڵان

لەگەڵ بەتاڵان مەبـە بە هاوسـێ ؛
هاوسێ لە هاوسێ ئەگری سەراسێ(۱)

دەخیل صـەددەخیل ڕەفیقی خـراپ
خۆتی لێلادە بێحـەددو حیســـاب

موجاوەرەیان ســـەممی قاتلـــە
مایـــەی ڕەفیقیان پووچ و باطلـــە

تووی نیفاقیان ســەوز ئەكا لــەدڵ
دارێ ، بەرەكەی هەمووی غەشەو غەل

لــە هــــەڤاڵەوە زۆر مرۆڤی پـاك
دڵی تاریك بوو ، وەك ئـەهلی هیلاك

لـەلای ئاسنگەر كەسـێ دانیشـــێ
جلی ئەســـووتێ ، یا ســەری ئێشێ

لەگـــەڵ پیاوچاكان ببـە بە ڕەفیق
كە خۆشتویستن ئەگەیتە تـەوفیق

---

(۱) سەراسێ : سەرئێشە ٠

هیممـــەت داواکـە لـە پیاوچاکان
له سینەصافان ، لـە دەروون پاکان

فائیدەبەخشن صـولەحای ئوممەت
مەجلیسیان پررە لە نووری رەحمەت

هەرکەس دانیشی لە حوجرەی عەططار
لـــە دەماغیدا بـوی خوش دەکاکار

بگەرری لە شوین ماموستای شەفیق
خاوەن دیانـەت ، طالبی تـــەحقیق

عالمی عامیـل طەبیعـــەت عـــالی
خوورەووشت پەسەند خاوەن مەعالی

وەك دەرس ئەخوینی زور بەموشتاقی
فیربـــە وەزعی حـال‌و ئـــەخلاقی

لەگەل ئوستاذا رەفیقی مەســـروور
تەبیعـەت شیرین « نور عـلی نور »

مەحەککی رەفیق چوارن بـە صیحەت
تەماعو، سەفەر، هاورری‌یی‌و، میحنەت

(دایـەن) ئـەخلاقی منـال ئەناسـی
هاوسی ئـــەناسی حالی دراوســـی

کـە ئەمەت دەس‌کەوت لابدە لەغەیر
مەکەوەرە دوای وەهمی «ثَمَّ الخیر»(١) !

---

(١) وەهمی « ثم الخیر » : واتە دوودلی‌و دانەمەزران لەسەر رایەك .

ئــــەدەب لــە ئوستاد حازرو غائیب
هــــەم لــە رەفیقی رەشیدو طالیب

موطالەعەی شــەو لەگــەل تی‌بینین
دەرسی چیشتەنگا لەگــەل تیفکرین

یەك لەدوای یەك پیاچوونەوەی دەرز
لەگەل هەڤالی رووخوش‌و ســەربەرز

بەومەرجەی کــــە خوت بەکەم‌بزانی
ئــــەتکا بە ئــــەهلی عیلمی رەببانی

کە پیاچوویتەوە ئــەنجا بیکەبــــەر
بەرکردنیکی ســــاغو بی‌کــــەدەر

بــە دەوری داییم قــــەت ناچی لەبیر
قەترەی ئاو ئــــەکا لــەبەردا تەئثیر

هــــەلبگرە داییم قەلــــەمو دەوات
هەر عیلمیکت بیست بینووسە لەلات

هــــەرچی ئەزانی لی‌مەبە بــــەطال
هــەرچی نازانی بیزان بــە سوئال

لە پرسیار کردن کەسی ئــەیبی عار
کە خوی بــــەنازان بکا ئیعتیبــــار

ئەگــــەر طـالبی ئــەنواعی دەرسی
هەرکەس فەننی خوی ، ئەبی بپرسی

هەردلێ عەقلێ ، هەرســــەری فامێ
هەرکەس مەشرەبێ ، هەردەم کەلامێ

لەگــــەڵ موعانید بە فیکری بــەطاڵ
دەخیلە نەکـــەی نیزاعو جیـــداڵ

کە بووی بە عالم باش‌بکە عەمـــەل
عەمەلی خالیص ، خالی لــە خەلـــەل

خوێندن بــۆ زانین ، زانین بۆ کردن
کــردن نافیعــــە بو دوای مــردن

ئــــەم نەسیحەتە بـــە ئیعتیبـــارە
مـــەرو بو موشکیل بی « استخارە »

نویژی دوورکات دوعای مەشهوورە
لـــەبوو موهیممات گــەلی زەروورە

پاش « ئیستیخارە » هەم ئیستیشارە
بەشەخسی ئــەمین ئــەمری موختارە

« صلاة الحاجه »یش هەیــە بی‌گومان
بو کرانەوەی موشکیلەی ئینسان

دوعای ئەم نویژەیش هەیەو مەئثوورە
لەپاش نویژەکە ســەرانسەر نوورە

ئینسان سی‌بەشە : شتو نیوەشت
بەشی سی‌یەمین پی‌ی ئــەلین ناشــت

شت‌ئەو کەسەیە کاری ری‌کەوت بووی
عەقلی‌تر بینی بو لای عەقلی خـــوی

نیوەشت کەســی هەر بە عەقلی خوی
یا بەعەقلی غـــەیر کاربکا بو خــوی

ناشـــت کەسیکە خـــوی ناعاقلـە
لەپرســـی پیـاوی ژیریش غافلـــە

( وفـّقنــا اللە عـــلی الأ تّعـــاظ
وادخَلنا فـَـي القــوم الو ْعـّاظ )

## بابی شەشەم باسی ئەوشتانە ئەکات
## کە بیرو هوش کەم ئەکەن

ئـەلیم بە عەونی پادشـــای ئـەکرەم
چی بیرو هوشی ئینسان ئـەکا کـەم

خوراکی ناپاك ، شـتی ترش‌و تـال
مـــەیخو زیانە بو عەقل‌و کـــەمال

لەهەر خوراکی ، مشکی بەد مـەزاج
خواردوویە ، مەخو تا نەبی موحتـاج

خواردن‌و نووســتن لـەمیزان زیـاد
زیاد لە نەگبەت عەقل ئـەدەن بەباد

لەپشتی سەرت مەگرە کەلەشـــاخ
زیانـە لـەبو ووشیاری‌و دەمـاخ

لەهـــەموو بەدتر خەفـەت‌و غـەمە
ئینسانی غـەمبار حافیزەی کەمـــە

زەرەرە ، مەخــــە کیلی مەقبـــەرە
هـەم خویندنەوەی خــــەیلی زەرەرە

مـــەراقی زیاد نـــەزەری حـــەرام
تەماشـــای پیسـی زەرەرە بو فـام

پیکـــەنینی زور گالتـــەی بی‌پایان
زیانن لـــەبو حافیزەی ئینســـان

قـەت لە حەماما مەخوینـــە قورئان
مەکـە رەفیقی‌ی هـەرزەو منـــالان

## بابی حەوتەم

## قسەلەوانە ئەکا ئابرووی ئینسان زیاد ئەکەن

ئـــەوەی ئابرووی پی‌ئـــەبی زیـاد
عیبادەتی سـاغ لەگـەل زیکرویاد

هەم وەرعو تـەقوا ؛ ئـەتقا ئەکرەمە
نەصصی کـەلامی خودای ئەعلەمـــە

خولقو خووی شیرین مایەی عیزەتە
رەوشتی پەسەند وەسفی حەزرەتە(ص)(١)

کاکە ! پیت‌بلیم ئـەعلای خوش‌خوویی
شیرین کەلامی‌و گوشـادە روویی

رووخوشی چاکە لەگەل خاص‌و عام ،
مەخصووص غەریب‌و، فەقیرو، ئەیتام

رەحم بە بچووك ، ئەدەب لە گـەورە
مایەی سەربەزری‌و عیزەت‌و قەدرە

---

(١) ئیشارەیە بۆ ئایەتی : « وانك لعلی خلق عظیم » .

رەحمو دلت بـی خو تو ئینســـانی
ئولفەتت ببی ، نەك هەراســـانیی

« لا تَکُنْ فَظّـــاً غلیظَ القلبِ
وکُنْ رَحیمـــاً کَثیرَ الجَلْبِ »

ئەگەر ئەتەوی سەربەرز بی لای خەلق
خوت بەگەورەتر مەگرە بـە ناحـەق

بو دوست مرووەت ، دوشمن مودارا
ئینسان ئەباتە دەرەجـەی « دارا »(١)

لەگـەل خراپان جـەزا بەچاکـــە
ئەمخولقە خولقی شاهی « لولاك »ە

پەیداکردنی دوشمن زور ســەهلە
دوســـت پەیدائەکا هەرکەسی ئەهلە

خولقی قەناعەت زۆر شیرین طـەرزە
لە هــەردوو دنیا قانع ســـەربەرزە

گەدا ســولطانە ، ئەگــەر قانیعـــە
قانع گەدایـە ، ئەگـــەر ٠

هەم شوکری نیعمەت زیاد ئەکا نیعمەت
نیعمەت باعیثە بو شەئنو

عیززەتی نەفسو بولەندیی هیممەت
ئەتکا بە خاوەن عیززەتو قیـ

---

(١) دارا : پادشایەکی گەورەو بە ناوبانگ بووە ٠

قــــەدرو قیمەتت مــەدە بە دوونان
خوایــە دەهـــە ندەی نیعمەت‌و ژیان

ئەم نەصیحەتە ووردەو موقـــەدەس :
سەرمەبە ناوی مەحرەمانەی کــەس

چپە ، یا نامەو قسـەی خصووصـی
تو دەخلت نی‌یە بوچی ئەپرســـی ؟!

وەفا بـــەوەعدە ، راستی لەگوفتار
بـوت پەیدائـەکا پایەو ئیعتیبـــار

قەدری هــەرکەسی بگرە بـــەمیزان
لەگەورەو بچووك ، لەزاناو نـــەزان

بـەچاوی سووکی مەروانە فـــەقیر
خوی ناگوریتو فەقیر بـــە ئـــەمیر

هەرکەس لـــەمالی خویا پاشـــایە
ئەگــەر دەولەمەند ، ئەگەر گەدایــە

کومـەكبە لەســـەر عەمــەلی خیرات
موشکیل‌گوشا بە بو ئەهلی حاجــات

خوگر بە لەبەر میحنەت‌و زەحمــەت
تا ئەکریتەوە دەروازەی رەحمـــەت

دەخیل صەددەخیل نەشکینی هیممەت
شەیتان بەزەحمەت نەتخاتە توهمەت!!

جیهان لە ســووررا وینەی دولابـــە
هەرروژی یــەکی عالی جــــەنابە !!

هەرگیز مەطلەبت بەرمــەدە لەدەس
پشتت قاییم بی بە خودای ئەقدەس

نە دیتــەجی کار ، نە ئەتبرری خــار
بەبی خواستو برریاری « قەههار »

کەوایــــــە خـــوا ئیرادەو حــوکمی
ئەبی خوگربی ، هەرچەند بی حیلمی !

بەخۆشی سەهلە؛ هەموو کەس عەبدە !!
عەبدی موجەررەب هاوسەری «سەعد»ە

بــەلام بخوازە لــە قاپی رەحمـــــەت
باری وانــەدا دەرچی لــە تاقـــەت

خولاسەی کەلام : نیشــانەی مەردان
خورراگرتنـــە لـــە کــاتی دەردان

ئەگــەر ئەتەوی پایەی ســـــەعادەت
لەدنیای روشن بتبی ســــەخاوەت

ســــەخی حەبیبە بـــەلای خــواوە
ســــەخی گەورەیە بــەروی دنیــاوە

بە بەخشش موشکیل زوو ئەبی ئاسان
« ان الانســـــان عبد للاحســــان »

صـــەدەقە : پەنهان ، یا ئاشـــکرایە
هوی بەرزی پایــەو دەفعی بـــــەلایە

نازانی نــزای دامـــاو رەوایـــە ؟!
بەزەیی خوایش بیبەرو دوایـــە ؟!

دەرگایی لەســـەر گـــەدا بی قاییم
لەســـەر طەبیبان گوشادە داییم !

هەناســەی فەقیر زور بەخروشـــە
کوورەی سەطوەتی خودایش بەجوشە

بو هەردوو دنیا ، لــە دوای ئیمان ،
چاکەیە لەگــەل دراوســیو میهمان

هەرکەس پررئەکا توشە بو میهمان
ئەژی بە عیزەت ، ئەمری بــە ئیمان

تەکلیف مەکیشـــە زیاد لە میزان ؛
تانەبی بەشــەرر حوببی عــەزیزان

هەرچی خودا دای بیهینە ؛ خوشـــە
بو میهمان چاکەو خویشت بینوشـــە

« مَن زار حَيّــــاً ولم يَذُقْ شَيّي
فَكَانَّمــــا زارَ غيرَ الحَـــيَ »

بیداریی ســـەحەر بکە بــە عادەت
بە دوعای مەئثوور بکررە سەعادەت

چلویەك دفعــە لە کاتی ســـەحەر
« یاعــەزیز » بلی ؛ هەیەتی ئەثـــەر

ئاخری « اســراء » ئایەی عیززەتە ؛
بیخوینە، چاکە؛ ئەمری حەرزەتە (ص)

« هَـــدانا اللــهُ للخلق الـــکريم
وَوَهَبَنـــــا النعيـــم المقيـــم »

# بابی هەشتەم

## باسی ئەوشتانەیە کە ئابرووی پیاوئەبەن

بوت بەیان ئەکەم هوبرای ئەشـرەف
هــەرچی ئابرووی پی ئەبی تەلــەف

دوو رروو نابینی شــەئن و ئیعتیبار
نە لە لای خزمان نە لە لای ئـەغیار

ئینسانی لار بی هەر رووی لە عوسرە
مالی چــەپ‌ولار هەرکەم‌و کەســـرە

لەگەل پیاوچاکان شـــەررو ستیزە
ئابرووت ئـەبا ، ئـەتخا لـــەریزە

شـــەررو بەدکردار خەیانەت پیشە
نمەك بەحـــەرام دەردی لە رریشـــە

قـەدری نامینی پیاوی بی ئـــەدەب
هەرزەو هەرزەگو ناگا بــە مەطلەب

هەرکەس بەکەسـی حەسەد بکیشی
ئابررووی ئەرراو ، دلیشــی ئیشی

تەماع رەنگ‌زەردیت دینی بەسەردا
بـــەرگی ریسواییت ئـەکا بەبەردا

هەواو تەکەببور بەدە بو ئینســـان
ئەخاتە شانت نیشـــانەی نوقصـــان

باش ئاگادار بـه پێی نالین هـــەوا
پاكبی لیباست ، عـەبا ، یا كـــەوا

هەرچەن بو دەفعی سەرماو گەرمایە
زینـەتی ناوی شـــەخسی بەمایـــە

بەڵام پۆشـاكی حـــەلالو لـــەتیف
موبارەكتبی ، بیپوشـــە زەریف

خو جوانراگرتن شـــەرعەن رەوایە
خاوینیی مایـــەی رەزای خوایـــە

مـەعنای تەكەببور ئەوەیە كـــە وا
خوت گەورە بگری لەسەر « ماسیوا »

بەهـــەموو رەنگی دەعیـە زیانـــە
بـو دینودنیـــا تالیی ژیانـــــە

فیزو دەعیەی تو گـەر بەســامانە
مال وەكو سیبەر روو لـە نەمانـــە

جا ، پیاوی هـەژار كـە نابا مـالت
بوچ ژیردەستە بی لـەبو ئیقبالت ؟!

شـیعری بـــەزمانی فارســـی باوە
مەعنای ئـەمەیە لیرە نوســـراوە :

كـە من رازی بووم بـە نانێكی جـۆ
چێمە لە «خاقان»، چیمە لە «خەسرەو» ؟!

ئەگەر ئەنازی بە ناوو نەســـەب :
باوكت وەزیر بوو گەورەو موقەررەب

بزانــــه دنیــا دەورانـــــه
ئەمررو ئەمانــه ، سبەی ئــەوانە !!

گــەر ئەلی‌ی باوکم بەطەریقەت بوو
یاخـــــو عالمی بەحـــــەقیقەت بوو

ئەوە بــەتوچی ، ئەگــــــەر عاقلی ،
مــادام لــــه عیلمی ئــــەوان غافلی

ئەگەر ســـەییدیت عەلەوی ئەفضەل
وەختی شـــەریفی کە بت‌بی عەمــەل

فریات ناکەوی گەورەیی نەســــەب
«لا يغني النسب ؛ حسبُك الحَسَب»

باش تی‌بفکرە لەگــــەل بەصـــیرەت
لە قسەی (حەزرەت) لەگەل عەشیرەت

ئاخری ســـوورەی « شعراء » بینــــــه
تەفســــیری لــەلای زانا بخوینــــــه

عــــــەلاوە ، نەســـەب بی‌ئیختیارە
ئینســـان ئینســـانی فیکرو ئاثــارە

ئەگــــــــەر عالمی خاوەن مـــــەهارەت
عیلمی خوت بو خوت مەگرە حەرارەت

لەگـــــەل دەعیــەدا عیلمت بــــەطالە
عیلمی بی‌عەمەل عـــەینی ضــــەلالە

ئەگەر صالحی صـــاحیب عیبــادەت
شوکری خوا بکە کە دای ســـەعادەت

ئەگەر هەیئـــەت‌و رەنگت لائیقـــە
تو خــوت بی‌دەخلی ؛ خــوا خالیقـــە

سەگیکی قــەبیح لــە ســـەرەری‌دا
شەخسی بــە ســووکی رروانی پیدا

سەگەکە پی‌ووت بــە زبانی حال :
«ئەگەر بەخوم‌بی پیم‌خوشە جەمال !!

چارم‌ناچــارە ؛ خـــەللاقی ئەکبــەر
منی کرد بە سەگ ئەتویش بە بەشەر !!»

دوژمنایەتی یـــەزدانی قـــەههار
لەگەل سی‌چینە بەگویرەی ئـــەخبار

یەکەم سوودخوران ؛ ئایــەی ئیلاهی
« فاذنوا بحرب » تا « مِــن اللــهِ »

دووەم کەسانی خاوەن تەکـــەببور
خوا دوژمنیانە ، ئەشــکین کوتوپرر

سی‌یەم دوژمنی فیرقەی ئـــەهلی دین
دوژمنن لــــەبو رب العـــالمین ٠

دوژمنی خودا ئـەنجامی وایــــە :
بی ئیمان برروا بی‌ســـوودو مایــە

خودا لاماندا لــە شـــەررو زەحمـــەت
دواییمان‌بینی بــە خیرو رەحمـــەت

## بابی نویەم : قسە لەوانە ئەکا کە بینایی چاو زیاد ئەکەن ..

بوت بەیان ئەکەم ئەی نووری دیدە
هەرچی بو نووری چاووت موفیدە

یەکەم : چاو رەشتن بە سورمەی سیا
میلی زیررو زیو ، یا روح تووتیا

بو هەر چاویکت سی میل سوننەتە
لە وەختی خەودا دەئبی حەزرەتە

دووهەم : خویندنی کەلامی باری
پی ی روشن ئەبی دوو دیدەی قاری

سیهەم تەماشای شیرین جەمالان
لە ئەربابی دین صاحیب کەمالان

چوارەم : تەماشای جەمالی ئەحباب
براو باوکو دایك یا باقی ئەصحاب

پینجەم : تەماشای خەطی خوش کالا
شەشەم : تەماشای نوقرە یا طلا

نافیعە بو چاو سەیرانی بەهار
تەماشای شەتاو باخو لالەزار

دەس نویژ گرتن بە ئاوانی سەرد
ئاو بەلووتادان لە چاو ئەبا دەرد

نەفع ئـەدا بە چاو نەفعیکی تـــەواو
لــە ئاوی سـاردا بکەیتـەوە چـاو

بینی بیِن‌خوشـان صاحیب ثەمـەرە
خوشـی‌ی دەروونەو نووری بەصەرە

مووی لووت بە مەقەس مووی بن بال بکێش
واچاکە بو چاو ، مەترسـە لە ئیش

ئەگەر بو نووری چـاو بە پەروشـی
مووی لووت بە موکیش قەت رانەکیشی

نزیکی ئـاگر ، یا سـەرمای زیـاد
مەستی‌و زور خوری‌ی چاو ئەکەن بەرباد

دووکەڵو غوبار چاو ئەکەن موحتـاج
هەرچی سپی بی وەکو بـەفرو عاج

شـەلەم بـەکاڵی ببرژی تـەواو
بیخـو نافیعـە لـەبو نووری چـاو
بـەکارە بوچاو هـەرچی موسهیلە
وەك سینەمـەکی‌و گوڵو هـەلیلە

گیـای قنگاوڵـە زور بەثەمـەرە
ببرژی بەسـاج تی‌ی بخری کـەرە

## بابی دەهەم قسە ئەکا لەوانەی
## کە هوی زوربوونی روزین

بابی دەهـەمین بەقـەدەر تاقـەت
ئەنووسین ئەسباب دەولەت‌و ویسعەت

هەرکەس بەدەوام «طاها»و «واقیعە»
بخوێنێ ، دائیـــم رزقی واســـیعە

سوورەی «مزّمّل» ، «واللیل»و «نشرح»
مایــەی دەولــەتن بزانە ئەصـــەح

حیفظو خوێنــدنی ئایاتی قورئــان
صەلاوات لەسەر سەیدی عەدنان (د٠خ)

دەوامی دەس‌نوێژ مایەی صـــەلاحە
بۆ ماڵو ســامان وەکوو ســـیلاحە

لە پاشی دەس‌نوێژ ریشت دابینـــە
« انا انزلنا»ش ســـێ‌جار بخوێنـــە

زووبڕو مزگــەوت ، دەرەنگ بیرەدەر
ئــەبێ بەخاوەن ثەروەتو ثەمـــەر

نوێژی ڕێك‌وپێك بە خەوفو خەشیەت
ئــەبێ بەمایەی سامانو نیعمـــەت

سوننەتی بەیان ، یاهی چێشتەنگاو
مـــەیان فەوتێنە ئـەی‌بینایی چـاو

عیشا لەمزگەوت لەگەڵی «وتر»ی ماڵ
ســەبەبە لە بۆ دەولەتو ئیقبـــاڵ

« آیة الکرســـي » قەدری مەشهوورە
بۆماڵو ، بۆ ذیهن ســـەبەبی نوورە

« قـــل اللهـــم مـــالك الملـــك »
بخوێنـــە ئەگـــەر بەتەمای موڵکی

« فَسُبْحَانَ اللهِ حين تمســـونَ
صـــوبحو ئيواره تا « تخرجـون »

هـــــهم « لا مـــانعَ لمـــا اعطيتَ
ولا مُعْطِـــيَ لِمـــا مَنَعْتَ »

لـــهپاش نویژه‌کان بیلی بـــه‌دەوام
ســامانو روزیت بو دیته ئـــه‌نجام

له‌کاتی سه‌حه‌ر یه‌کصه‌د ته‌سبیحات
ئه‌بیتـــه مایـــه‌ی رزقو بـــه‌ره‌کات

بلی بـــه‌م نه‌هجه : « ســـبحان الله »
« ویحمـــده ، سُـــبحان اللـــهِ

العظیـــم » ، ئه‌مجار « استغفر اللـــه »
روزیت بـــو دینی به‌عـــه‌ونی اللـــه

هـــه‌م « لا الاه الا اللـــه » یـــه‌قین
« الملك الحق » هـــــه‌تا « المبین »[1]

له‌شـــه‌وو رورژا صه‌د ده‌فعه‌ی کامیل
رزقو ســـامانت بو ئـــه‌کا حاصـــل

« استغفر الله » صه‌د یا حه‌فتا جـــار
ســـــه‌حه‌ر بیخوینه ؛ هه‌یه‌تی ئاثار

تا هـــه‌زار ده‌فعه ذیکری یا وه‌هـــاب
رزقت‌بو دینی بی‌حـــه‌دو حیســـــاب

---

(١) واته : « لا الاه الا الله الملك الحق المبين » .

حەزرەت ئەفەرموی بە ئەهل‌و بەیتی :
دەس بکەن بە نویژ لە وەختی سەختیی

کە نویژیان ئەکرد ئەیانبوو نەجات
« واستعینوا بالصبرِ والصلاة »

بو دانەوەی قەرز بی‌طوولی موددە
دوعایە هەیە ، نەقلە لە « عدّە »[1]

دوعا زور هەیە لە « اصول الرفق »
تەصنیفی جەلال بوو یسعەتی رزق

نەفەقەی واسیع بو مال‌ومنال
رزقت زور ئەکاو ، شاد ئەکا ئەحوال

گەر سەحەر رەویی ، یا شەورەوی کەی
بو هەر داخوازی ، بەئاوات دەگەی

شورینی حاجەت ، پاکیی حەوش‌ومال
سەبەبە لەبو سامان‌و ئیقبال

گفتوگوی شیرین ، هەم رووگوشادیی
باعیشە لە بو رزق‌و دلشادیی

لە بەرو دوای خواردنی طەعام
هەردوو دەس بشو ئەگەی بەمەرام

فائیدەی زورە بەواتەی « خەبەر »[1]
تەنوورو ، ئەسپو مایین ، لەگەل مەرر

(١) ناوی کتیبیکە لە کتیبەکانی ابن حجر .
(١) خەبەر : حدیثی پیغەمبەر (د . خ) .

خێرکردن ، چاکە ، نان بە میوان دان
بوت ئـەبارینی روزیی ئاســمان

پاداشی چاکەش حەوســەد چـەندانە
زیاتریش ئــەبی ؛ واتـەی قورئان

## ووریاکردنەوەیەك

باش خەبەردار بە ئـەی نووری دیدە !
لەمنەصیحەتە ، کـــە زور موفیدە :

کـە دنیا شوینی مادەو ئەســبابە
باسی « ذو القرنین » نەصصی کتابە(١)

من وەهــا نالیم تو بروی لــەماڵ
دوعا بخوینیو دانیشــی بــەطاڵ !!

ئەبی صــەنعەتی باش بگریتە دەس
تــەوفیقت بدا خـودای فریاد رەس

وەك بازرگانیی یاخـو فەلاحــەت
یا کاریکیتر خــاوەن صــەلاحەت

عیلمو خەتت بی لەگەل خوشخەتیی
تا مەهتووك نەبی رووتو پیپەتیی

هــەتا ئەتوانی بــەدەم داعی بــە
بو دینو دنیاش داییم ســاعی بــە

---

(١) ئیشارەیە بو ئایەتی [ ویسئلونك عن ذي القرنین ] لە سوورەتی ( الکهف) کە باسی ئەوە ئەکات ( ذو القرنین ) ئەسبابی بەکارهینا ٠

بی یارمەتی خوا کە سبیش بەطالـە
گەرخوا نــەیدا ثەروەت مەحالـــە

زور ئینسانم دی بە کەسبو زەحمەت
دنیای دەس نەکەوت، رویی بە حەسرەت

زور ئینسانیش هەن بی دەردو زەحمەت
ئـەگا بەمالو نیعمەتو رەحمــەت

مەقصـوود لەدوعا جـەلبی رەحمەتە
چون خوای عالـــەم بەمەرحەمەتـــە

مەبـــەس لـەدوعا ئـەوەیە خـــوا
روتبەی مەحبووبیت بدا بەســـەردا

وەصیەتت بیو ، نەصـــیحەت نامــە
رای بگرە بـــەدل هــــەتا قیامـــە

قــەت خزمەتکاریی مەکە لـــەدنیا
نە بو ئەهلی دین ، نە ئـەهلی دنیـــا

شەخصی خزمەتکار خولقی فاســدە
لــە دینو دنیا مایــەی کاســـیدە

خزمەتکار داییم سووکەو بیمایـــە
داییــم مەشـــغوولی درووو ریایـــە

بی ئابروو ئــەبیو بی پایەو هیمــەت
عومری بــەبادە بیموزدو مننــەت

وەختیکیش ئەمری بـەدەردو وەبال
ئـەهلو منالی ئـەرون مالـــەومال

لە صەد دوو کەسیان صاحیب نیعمەتە
ئەویش نیعمەتی بوھتو غەیبەتــــە

زور باشــە بە روژ بکـەی حەممالی
بـەس نییە بەشــەو صاحبی مــالی

لــەمریوە بررو ئەگەیتە مەقصــوود
« انـــــە هــو الرئوف الـــودود »

## بابی‌یانزەهەم باسی دوعای مەئثوور ئەکات

بابی یانزەهەم بەعەونی غــــەفوور
ئەکـەم بەیانی ئەدعیەی مـــەئثوور

«قل الحمد» ئاخری سوورەی «سبحانه»
دەوایــە بوغــــەم راستی بیزانــــە

هــــەم « لا الاه الا اللــه »ی جـەلیل
« حســـــــبی اللـــــه ونعم الوكيل »

دەوایــە بو غەم مەبـە موشـــــتەبیە
« اللــه ربــي لا اشــرك بــــــه

شــیئاً »تا سی‌جار ، بەلام هەمووجار
کەلیمەی « الله » باش بکەی تەکرار

« آية الكرسی »و « آمن الرســـول »
بیخوینە دوعای پی ئــەبی مەقبوول

« یا حیّ، یا قیّوم » لە وەختی سوجدە
زور زور موفیدەو پیت‌ئــەدەم موژدە

« يا ذا الجـلال والاكــرام »ی زور
بیخوینه ؛ نـەفعی دیاره وەك خـور

بو زەحمەتباری شیخی « نەوەوی »
تەعلیمی فەرموو دەوای مەعنــەوی

بـە « بسـم الله الرحمن الرحيـم »
« لا حـول ولا » هـەتا « العظيـم »

ئاخریان تــەنیا مایــەی شیفایه
بو نـەوەدونو عیللـەت دەوایـــه

شــەخصی داوای کرد له مولاعـەلی
بو جەبری گوناه دوعایــه جــەلی

یەکی دوعای باغ ، یـەکی بو مندال
یـەکی له بو ئاو ، یەکی لـەبو مـال

بو هەمووی فەرمووی ویردی ئیستیغفار
به شــەرطی دەوام لەگـەل ئیعتیبار

بەدلیل فەرمووی له سوورەتی «نوح»
ئایەی «فقلت استغفروا»ی مەشرووح

تەسبیحات لەبو دەولەتو ویسعەت
بیکه به عادەت ئـەیبی مەنفەعــەت

ئایاتی ئــەرزاق بو جــەلبی روزی
ئایاتی فتــووح لــەبو فـەیروزی

تەفسیری «احزاب» له «روح البيان»
چل کەلیمەی فەتح باش ئەکا بـەیان

بو دەفعی شـــەرری چاوی ئینسانی
زیـانی دابی لـــــە موســــــولمانی

بە نەقلی «توحفە» بابی «جنایـــەت»
دوعای «ماشــا اللّٰه» ئــەکا کفایەت

بیخوینە لەســەر موبتەلا بـــە چاو
زوو شیفای بو دی شیفایە تـــەواو

بو دەفعی شـــەیتان «اعوذ باللــه»
بوفەتح و نەصرەت «نصــر من الله»

ئەگەر لە جننیو شـــەیتان ئەترسـی
بکـە بـــە ویردت «آیة الکرســـي»

گــەر بەتەرتیبی مەولانای «جامی»
خەتمت کرد قورئان صاحیب مەرامی :

جومعە : «بەقەرە» تا سوورەی «ئەنعام»
شەممە لە «ئەنعام» تا «یووسف» تەمام

یەك شەممە :«یووسف» تا «طاهای» مزبووت
دووشەممە :«طاها» هەتا «عەنکەبووت»

سیشەم :«عەنکەبووت»تا سوورەی «تەنزیل»
چوارشەممە :هەتا «واقیعەی» جەلیل

پینجشەم «واقیعە» هەتا بـــە خیتام
«خەتم الاحزاب»ە بو قەصـــدو مەرام

لە سوورەی «یاسین» سیجی مەعلوومن
لەوسی جیگەدا ئەســـبرار دەکتوومن

« وكلّ شـــيء احصـــيناه فـــي
امـامٍ مبين » ئـــەووەلی وافـــی

« كلّ في فلك » هــــەم بكە تەسليم
« ســــــلام قولاً من رب رحيـــم »

سوورەتی « ياســين » تەواو بخوينە
لەوسی‌جی قەصدی مەطلووبت بينــە

گەر دوعا بكەی بە ئیسمی ئــەعظەم
مەقصوود دیتەجی ، ببە خاترجـــەم

ئەگەرچی ئەلین : ئیسمیكە مەكتووم
ئەرجەح « اللهْ ، يا حيّ ، يا قيّوم »

نەقلە لە عـــەلی « يا هو ، يا مَن هو
يــا مَـــن لا الاهَ الاّ اللــــــــهُ »

جەعفـــەری صـــادق عالمی ماهــیر
پینج دەفعە فەرمووی : « ربنا ظاهر »

شەش ئایەت هەیە بی‌نەقص‌و مەزید
تا «ذات الصدور» لەسوورەی (حەدید)

لەوانا ئیسـمی ئەعظـــەم داخلـــە
بە تیلاوەتیان مەقصـــوود حاصـــلە

هـــەركام لە ئەسمای واجب الوجود
مەعنای دیاری‌یە بەگویرەی مەقصوود

ئیسمی «يافتاح» بو فەتح‌و نەصرەت
وەكو «يا غفّار» لــــەبو مەغفیرەت

بۆ عەطاو بەخشش ئیسمی «یاوهاب»
«ودود»و «رئوف» بو حوببی ئەحباب

بو رەحمی ظالم ئیســـمی «یارحیم»
بوسەخاو کەرەم ئیسمی : «یاکریم»

لـەبو مەحفووظی ئیسمی «یاسلام»
بوعیلمو عیرفـــان «علیم»و «عــلام»

بو شتی گومبوو ئیســمی «یاهادی»
«یاقهّار» لـەبوو قـەهری ئـەعادی

هەتا ئەتوانی لە دوعای مـــەئثوور
بـــەنیازی خیر بیکە بـە دەســتوور

مەئثوور ئەوەیە مەنقوولبی لەســەر
قـــەولی ئیمامان ، یا «خیر البشـــر»

زانایان ئـەلین لەبـــەر ئیعتیبـــار
« اذهب بعِ الدار واشتر الاذکار »(۱)

« الحصن الحصین » ، کتیبی « عدة »
دوعای ئـــەمانە گەلی پەســـەندە

## بابی دوانزەهەم باسی ئادابی دوعا ئەکات

کە دوعات زانی بە وەجهی صـــەواب
ئـــەبی بزانی تـــەرتیبو ئاداب

---

(۱) اذکار : واتە کتیبەکەی ئیمام یەحیای نەوەوی کە ناوی « اذکار»ە .

لــــەبو موســولمان دوعا ســـیلاحە
شەخصی دوعاخوێن روو لە صــەلاحە

دوعا مایەیـــە بو نووری هـــودا
بو خێرو خوشــی ، بو رەزای خـــودا

هەرکـــەس بو دوعا تــەوفیقی درا
دەروازەی قەبوول لیی‌ی گوشادکرا

دوعا ویردت‌بی وەختی خوش بەختی
تالیت قەبوول‌بی لە وەختی سەختی

نــەك لە خوشـــی‌دا نەکەی موبالات
بەسی وەختی سەختی بکەی موناجات

دەس‌نویژت ببـــی ما دام الامـــکان
رووبەقیبلـــە بە لــە هەموو مەکان

دەستت بو دوعا بولەندو گوشـــاد
بــەلوطفی خــودا دلت بکە شـــاد

« بســـــم الله » بلی کلیلی خـــیرات
پاش ئەوە حەمدو سەلام‌و صەلات

ئـــەمجار بیرە سەرطەلەبی حاجات
بەدوعای مەئثوور بکــە موناجـــات

لەخاتیمــەدا صـــەلات‌و ســـەلام
بوگیانی پاکی ســـەییدی ئـــەنام

چونکە مەقبوولە دوعا بو رەســوول
دوعا لەوبەینا باش ئــەکری قەبوول

بە صەدای خەفیف لەگەل تەضەرروع
بەنەبیو وەلی بکە تەشەففوع

موبالات مەکە بەئەهلی بیدعەت
لامەدە لەسەر جادەی شەریعەت

خونالیین نەبی صاحیب تەئثیرە
تەئثیر هەر لە بوو خودای قەدیرە

فەقەط پیغەمبەر روتبەی ئەعلایە
مەظهەری فەیضی ذاتی مەولایە

عولەمای کیرام ، یا ئەولیای دین
مەحبووبی خودان بزانە یەقین

لەکاتی ذیکری صەلاحەت کاران
بەرەکەت ئەرژی وەك سەیلی باران

تەوەسسول بەوان موفیدە ، موفید
« واللـه' اقرب من حبل الورید »

لە وەختی تەنگی ، نەقلە لە حەزرەت ،
داواکە لەخوا رزقو مەرحەمەت

بلی لە سەختی زور بەمەممنوونی :ـ
« یا عبادَ اللـهِ أغیثونـي »

« خاتیمە »[١] ئەلی : زور کەسی فەقیر
بەصوورەت ئەسیر ، بەسیرت ئەمیر

---

(١) خاتیمە : کتیبیکە دانراوی ئیبنوحەجەری فەقیهە ٠

لەسەر هەرکاری خوا بدا قەسـەم
قەسەمی ناخات خـەللاقی ئـەکرەم

جا ئاشـکرا بوو ئەربابی صـەفا
ئەسبابن وەکـوو دەوا بو شـیفا

ئینکاری سـەبەب ناکا بی گومـان
مەگەر یەکیکی سـەرکەشو نـەزان

لاکن خوت بگرە لەسـەر ئیقتیصـاد
نەك وەکوو عەوام ئەربابی فەسـاد

ئیفراطو تەفریط ئەخەنە مـەیدان
ئـەبن بەئەتباع دەجالو شـەیتان

وەها گوم ئەکـەن مەزهـەبو ئایین
جیـا نابیتـو دینـدارو بیدین

ئـەبن بـە هیزی خاوەنی ئـەوهام
بو طەعنە لەدین سەییدی ئەنام (د٠خ)

وەکـو (بادەوە) باییکی بەسـە
حەرفیکی بەسە هەرکەسی کەسـە

پیویستە لەسـەر عولەمای ئـەعلام
تیکوشان بو دین زور بـە ئیهتیمـام
خەلکی رزگار کەن لە جەهلو غەفلەت
ببن بە دوکتور بو دەردو عیللـەت

رەهنومایی کـەن صـەغیرو کـەبیر
لە فیرکردنیان هیچ نەکـەن تەقصیر

بابیینەوە سەر مەسەلەی دوعا
کەی وەرئەگیری لە قاپی خوا ؟

کاتی تایبەتیی لەبو موناجات
لە بانگا وەختی « حي على الصلاة »

لە سەرەتای بانگ تا قامەت کردن
دوعا نزیکە لەبو وەرگرتن

لە پاش نویژی فەرز یا خەتمی قورئان
لە وەختی سەحەر ، یا وەختی باران

لە شەوو روژی جومعەی مونەووەر ،
کاتی دیتە خوار خەتیب لە مینبەر

هەروەها کاتی ئامینی ئیمام
لە روژی جومعە ، یا باقی ئەییام

لە شەوی «بەرات» ناوەندی «شەعبان»
بە دریژایی مانگی رەمەزان

شەوی هەردوو جەژن ، عەرەفەی قوربان
نزا گیرایە هی شاەو دەربان

لە نیوەشەودا ، کەسی نەبی بیدار ،
سییەکی دوایی ، کاتی ئیستیغفار

دوو لەفظی «الله»لە سوورەی «ئەنعام»
دوعا لەوبەینا ئەگاتە ئەنجام

لە هەموو جیگا خوا حازرە
بو هەموو جیهان لوتفی ظاهرە

« يجيب المظطر اذا دعاه
لا يكشف السوءَ عنكَ سِواهُ »
بەلام یەکەم شەرت : لوقمەی حەلالە
شەرتی دووەمین : داماوی حالە

شەرتی سی‌یەمین : نیازی حەلال
وەك گوشادی حال ، تەحصیلی کەمال

یا دەفعی فیتنەی عائید بە بەشەر
یا نەجات‌دانی هاوری‌ی سەروەر

یا پەیدابوونی صالح لە ئەولاد
یا دوزینەوەی صاحبی ئیرشاد

نەك لە هەرکەسی رقت داگیرسی
بو دوعای زەرەر بەرزوکەی دەسی

ئەم دوعای شەررە هەم دەنائەتە
دەنی کەی نزیك بە ئیجابەتە ؟

بو صاحیب دوعا ئەم دوعا شەررە
بو گەردنی خوی تەوقی زەرەرە

بخوینەرەوە بەفیکرو تەمکین
جوملەی « لا یحب » هەتا « معتدین »

باش خەبەرداربە لەم‌حەقاییقە
بو ئەهلی عیرفان گەلی لاییقە ..

## خاتیمـە

بو ئەم «خاتیمە» باش‌و موختەصـەر
خوت حازر بکە ئـەی نوری بەصـەر

لەورۆژۆ کەوتـــە دنیـاوە ئـادەم
نەسلی پەیدا بوو لە کورەی عالـــەم

چونکـە ناقیصە عیرفانی بەشـــەر
بو دەرکی هـــەموو قازانج‌و زەرەر

بو تەعلیمــاتی ئـەحکام‌و ئـــاداب
بو شـارەزایی ریی چـاك‌و خـراپ

بە مەحضی ئیحسان خالیقی عالـــەم
لە هـەر زەمانی بو بـەنی ئـــادەم

ئیختیـاری کرد بو پیغەمبـــەریی
ئینســانی کامیل لە نوقصان بـەری

لەفظی (پیغەمبەر) یانی پەیغام بـەر
پـەیغامی خـودا ئـەبا بو بەشـــەر

ئەفەرموی : فلان‌عەمەل ئیحســـانە
ئـــەوە تەواوە ، ئـەوە نوقصـــانە

ئـەوە حـــەرامە ، ئـــەوە حـەلالە
ئـەوە دروستە ، ئـەوە بەطالـــە

ئـەو ری خراپە ؛ ریی شـەقاوەتە
ئـەم جادە چاکە ؛ ریی سـەعادەتە

بو ئەو زەمانە هەرچی بی مـەقبوول
خوا بە مەلەکدا ئەینارد بو رەسوول

ئەومەلائیکـە کی بو ؟ جوبرەئیـــل
حاملی وەحیو ئـــەمینی تـەنزیل

هـــەر بەمتەرتیبە دەورە بـەدەورە
پیغەمبەر ئـەهات بەوطەرزو طەورە

هەریەك بو قەومی چ زور بی ، چ کەم
لەیەك عەصردا چەندی ئـەبوون جەم

کە دنیا بـــەرگی تاریکی پوشـــی
بو اغوای بەشەر شەیتان تیکوشی

حەقیقەتو دین کـەوتە نەخوشـیی
ذائیقـــە تامی فەســـادی نوشـــی

کەوتە دنیاوە گومراهیو ضـــەلال
ئایینی فاسـید مەزهەبی بـــەطال

هەندی لە بو روژ ، هەندی بو قەمەر
یا بو ئەستیرە ، یا خۆ بو بەشـــەر

هەندی لەبو بت ، هـەندی لەبو نار
سوجدەیان ئەبرد زور بـە ئیعتیبار

تا ئیرادەی حەق رووی کردە تەقدیس
تەحمیدو تەمجید ، تەعلیمو تەدریس

موتەجەللی بوو بـە فەیضو کـەرەم
کـەوتە فەییاضی بو جەمعی عالـــەم

له قەومی عەرەب ، قورەیشی جەلیل
پاش فیرقەی زومرەی نەسلی ئیسماعیل

له خاکی حیجاز مەککەی موکەررەم
له پشتی ذەبیح (عبدالله)ی ئەکرەم

هاوردی‌یە وجود بە فەیضی بی‌حەد
ذاتیکی عالی ناوی « موحەممەد »

بە سورمەی صەفا موزەییەن بەصەر
بە شیمەی وەفا مەشرەب مونەووەر

راستگوو خوگر ، سەرکەوتوو ئەمین
بەشەرمو شکوو عیصمەتو تەمکین

هەر له مەککەدا ماوە بە کەمال
تاعومری عالی گەییشتە چل‌سال

بو شەوی عالەم بوو بە « چل‌چرا »
بوو بە پیغەمبەر له غاری « حیراء »

بو جینو مەلەك ، بو بەنی‌ئادەم
نەك یەك تایەفە ، بو هەموو سەرجەم

روتبەی نبووەت بەم گەیی‌یە کەمال
لەپاش ئەو بەعثی پیغەمبەر مەحال

بەبە لەمروتبە ، بەم بوو موختەتەم
بوو بەسەر چاوەی ئیحسانو کەرەم

وەحیی بو ئەهات بە شیوەی جەرەس
غەفلەتی نەبوو یەك‌لەحظەو نەفەس

بەنەهجی ئەمری قورئانی شــەریف
بەحیکمەتو وەعظ ، جیدالی لــەطیف

زور بەمەردانە بەســەعیو هیممەت
بیپەروا لەئێش ، لە لومەو توهمەت
دەستیکرد بەنەشــر ئەحکامی خودا
دایگیرسان چرای عیرفــانو هــودا

تیکیدا تەکیــەی کەفەرەو ئــەحزاب
یەك یەك پەیدا بوون شیرانی ئەصحاب
هـــەرلە مەککەدا خاوەنی « لولاك »
عوروجی فەرموو لە خەیمەی ئــەفلاك

لەشاری مەککە دوانزە ســالی خشت
خەلقی بانگ ئەکرد بو ریگای بەهەشت
جا هیجرەتیکرد لەسەر رەزای حەق
بەڵێ باشە روژ دەربی لـــە ئوفوق
چوو بو مەدینە بو نەشــری ئیرشــاد
بەحوسنی تەعلیم ، بە حەربو جیهاد
دەعوەتی فەرموو کورری گومراهان
کاغــــەذی نووسی بو پادشـــاهان
لــەویوە گرتی بە حەربو تەعـــەب
یەمەنو حیجاز ، جەزیرەی عـــەرەب

لەپاش یانزەســال بــە حوسنی لیقا
کوچی دواییکرد بو « دار البقــاء »
صــلاة اللهَ مَــع الســــلامِ
عَلیــه مَــعَ الصَّــحبِ الكرامِ

پاش ئەو خولەفاء : بووبەکرو ، عومەر
عوثمانو ، حەیدەر، حەسەنی ئەکبەر

بەهیزی سوپای صەحبو تابعین
رَضِـــيَ اللهُ عَنهـــمْ أجمعين

بە پەیرەوی ئەو بیپشووو پەروا
دنیایـــان پررکرد لـە ناوی خـــوا
جارجار بە تەدبیر ، جارجار بە شمشیر
ئەچوونە مـەیدان وەك شـیری دلیر

عولەمای ئوممەت بە هیزی تەقدیس
نوســیيانەوە ئایـەتو حــەدیث
زەحمەتیان کیشــا ئەهلی ئیجتیهــاد
بو نەشری دینو ئیرشـــادی عیبــاد
ئـــەبو حەنیفـــەو ، ئیمامی مالیك
شافیعیو ئەحمەد عالی مەســالیك

دوو شیخی حـەدیث لە خـەطا عاری
بوخاریو موسلیم مـەحبووبی باری
شیخی ئیعتیقاد دوو ذاتی مەشهوور
شیخی ئەشعەریو ، شیخ ئەبوومەنصوور

ئیهتیمامیان کـرد بو تـەبلیغی دین
أعْلاَ مَأواهُمْ رَبُّ العالَمِين .

**مەبەســت**

مەبەست ئەمەیـە کاری دنیاو دین
زەحمەتی ئەویو عەزمیکی بـــەتین

پیغەمبەر ، هاوڕری ، گرۆی تابیعین ،
باقی ئیمامـان ، زانایـانی دین ،

شاهانی بەداد ، زەحمەتیان کیشـا
لـە پیناوی خوا زور دڵیان ئیشـا

بویـە لـەدنیا دەنگیان دایـەوە
ئەستیرەی گەشیان ئەدرەوشـایەوە
هەروا لازمە بو فیرقـەی ئیسـلام
لەهەموو چەرخی سـەعیو ئیهتیمام
بو دینو دنیا پـەیداکەن سـەبەب
تا عومریان نەڕروا بەلەهوو لەعـەب

چون دنیا جیگـەی ئەسبابەو ماددە
بە زەحمەت کۆلان ئـەبی بـە جادە
تەنها ڕرووەمەکەن لـە دنیای خـراپ
گوم مەکەن ریگەی نەجاتو صەواب

گەر هـەر بو دنیا ریكبخەن تفاق(١)
« ما لكم فـي الآخـرةِ خَـلاق »
هەرکەس دنیای رووت دابنی بوخوی
هەرگیز بەمـەرام ری نا کەوی بـوی

دائیـم گیرودەی ئـازاری سـەرە
هـەتا تیرترە ، چاوبرسـی ترە !!

غـەنی حەریص بی ئەوە موحتاجـە
فـەقیری فـارغ بی ئیحتیاجـە !!

---

(١) تفاق : زەخرە ، ئەسباب ٠

له کەسبی دنیاش مەبن دەس‌بەردار
بـەبی پارەو پوول مەرونـــە بازار

باشـــە دنیایە مەزرەعـەی دینـــە
بوهەردوو دنیا هوی « ئافەرینـــە »

هـەرچی لازم بی لـــەبو تەقەددوم
عیلم‌و مـــەعاریف بکەن تەعـەللوم
زانینی هــەموو فـەن‌و صـەنابیع
بو نەوعی بەشـــەر واجبەو نافیـع

لـەم نەصیحەتە هیچمەکەن حاشـــا
ئایـــەت‌و حـەدیث بکەن تەماشـــا
بەلام طالب بن گشـــت بو نەظافەت
هوگر بن لـەبو خولقی شـــەرافەت

لاتـــان واجب بی پاراســـتنی دین
نەکەن رارابن ، بی‌هۆشی‌و تەمکین !
دین نووری چاوە هەم نووری دلـــە
هەرکەس بی‌دینـــە کوتا مـــەنزلە

بابی ئیجارەی «فـەتاوای» سـەروەر
ئەحمەد بن‌ْحەجەر نەقل ئەکا خەبەر :
« لیس الرجـــلُ رَجُــلَ الـدنیا
ولا الرجـــلْ رجـــلَ الاخـــری
بـــل الرجُـــلُ رجلهمـــا »
شەخصی دنیاو دین ئـەبی بەهومأ(١)

(١) وەك ئەڵێن : بالندەیەکە سێبەری بکەوێتەسەر هەرکەسی بەختیارئەبی ٠

یاران ! عەزیزان ! ئەشرافو ئەعیان !
ئەوەی کە زانیم بوم کردن بەیان ٠٠

لە ئیمـــە تەبلیغ ، ئیوە دیرایـــەت
لە خوای عالـــەم عەونو هیدایـــەت

رجـــام لەئیوە زانینـــەو عەمـــەل
تەوصیە بەحـــەق تا روژی ئەجـــەل

هـــەروەك رەوشتی ریجالی ئـــەعلام
« واللهُ المعطـــي لحســـن الختـــام »

تەئریخی نـــەظمی ئەپرسیٚ کەسیٚ
هەزاروسیٚصەد هـــەم پەنجاوسیٚ

مەسکەن : خانەقای «بیارە»ی عەزیز
کات : رەمـــەزان لـــە وەرزی پاییز

وەظیفە : تـــەدریس بو عولوومیدین
صاحیب : مورشیدی بەفەیضو تەمکن

«خالدی» مەشرەب ، «عوثمانی» حەسەب
هاوناوی «عططار» ، «عومەری» نەسەب(١)

أدامـــــه اللـــه مَـــعَ الاولادِ
لنشـــر الدین مَـــعَ الارشـــادِ

یارەب بـــەئاثار کبریـــای ذاتت
بە جەلای ئەسمای حوسنای صیفاتت

---

(١) مەبەستی خوالی خوشبوو «شیخ عەلائەددین»ە کە شیخی تەریقەتی نەقشیو ، مورشیدی بووە ٠

بەروتبەو مـــەقام ئـــەنبیای کیرام
مەخصـــوص ( محمد ) علیه الســـلام
برژیتـــە ســـەریان هـــەتا هەتایـــە
صـــــەلات‌و ســـەلام بەبی نیهایـــــە
بو قورب‌و قەبوول عولەمای ئـــەعلام
ئەولیای طـــەریق ، ئەشخاصی کیرام
لەگـــەل بەصـــەردا بدە بەصـــیرەت
پیمان ببەخشـــە پەسەندی ســـیرەت
بمانخەســـــەر ری‌ی وەفاو عیبادەت
لەگەل صیفەتی صـــەفاو ســـەعادەت

**مانگی رەمـــەزانی ســـالی ١٣٥٣ی کوچی**
**لە خانەقای بیارە ـ هەلەبجە ـ سولەیمانی**



**ســــــوپاس بۆ خـــودای بـــەخشندەو میهرەبان**
**کـــە یارمەتی‌دام ئەم‌نامیلکانە بە کۆمـــەڵ**
**لـــەچاپ بدەم • سبحان ربك رب**
**العزة عما يصفون ، وســلام على**
**المرسلين والحمد لله رب العالمين**
**١٣٩٣/٦/١ك ـ ١٩٧٣ز**
**عەبدولکەریمی مودەرریس**

## لیستەی هەڵەو ڕاست

| ڕاست | هەڵە | دێڕ | لاپەڕە |
|---|---|---|---|
| ئـەنوەر | ئـەووەر | ١٣ | ٨ |
| سەصتو سیدا | شەصتو سىدا | ٢٠ | ٨ |
| پاکیـن | پاکیات | ٩ | ١٦ |
| ئیدراکیان | ئیدراکیات | ١٠ | ١٦ |
| صـەریح | صوریح | ٥ | ٢٩ |
| خاصـان | خاصات | ١٦ | ٣٠ |
| منهجـە | منهچـە | ١٣ | ٦٦ |
| درسـی دوهـەم : دروستکردنی حەواء | درسی دوهەم | ١ | ٧٦ |
| دەکەز دزێژو | دەز دریژو سیسب | ١٥ | ١٠٠ |

تکا لە خوێنەرە بەرێزەکان ئەکەم ئەکەر ، بیجگە لەمهەڵانە ، هەر هەڵەیەکی تریان بەرچاوکەوت ، لێم ببوورنو ڕاستی بکەنەوە : بێ کومان مرۆڤ هەمیشە لەوانەیە دووچاری هەڵە ببێتو تەنها خودای مەزن لەمخەوشە دوورە ٠

# ناوەڕۆك

| لاپەڕە | بابـــــەت |
|---|---|
| ١٠١ | دەرسی بیستو پێنجەم : حەزرەتی داوود (د٠خ) |
| ١٠١ | دەرسی بیستو شەشەم : حەزرەتی سولەیمان (د٠خ) |
| ١٠٣ | دەرسی بیستو حەوتەم : حەزرەتی عوزەیر (د٠خ) |
| ١٠٤ | دەرسی بیستو هەشتەم : ذو القرنین (د٠خ) |
| ١٠٥ | دەرسی بیستو نۆهەم : حەزرەتی یوونس (د٠خ) |
| ١٠٧ | دەرسی سییەهەم : حەزرەتی زەکەریاو یەحیا (د٠خ) |
| ١٠٨ | دەرسی سییو یەکەم : حەزرەتی عیسا (د٠خ) |
| ١١٤ | دەرسی سییو دووەم : حەزرەتی محمد المصطفی (د٠خ) |
| ١١٦ | دەرسی سییو سێهەم : لە نبووەتیەوە تا هیجرەتی |
| ١٢٠ | دەرسی سییو چوارەم : هیجرەت لە مەککەوە بو مەدینە |
| ١٢٦ | دەرسی سییو پینجەم : خەلیفەی یەکەم |
| ١٢٩ | دەرسی سییو شەشەم : خەلیفەی دووەم |
| ١٣٠ | دەرسی سییو حەوتەم : خەلیفەی سییەم |
| ١٣١ | دەرسی سییو هەشتەم : خەلیفەی چوارەم |
| ١٣٢ | دەرسی سییو نوهەم : عەشەرەی موبەششەرە |
| ١٣٦ | دەرسی چلهەم : ئیمامانی موجتەهیدین |
| ١٣٩ | **چلچرای ئیســـــلام** |
| ١٤١ | حەدیثی یەکەم |
| ١٤٢ | حەدیثی دووەم |
| ١٤٤ | حەدیثی سییەم |
| ١٤٦ | حەدیثی چوارەم |
| ١٤٧ | حەدیثی پێنجەم |
| ١٤٩ | حەدیثی شەشەم |
| ١٥٢ | حەدیثی حەوتەم |
| ١٥٤ | حەدیثی هەشتەم |
| ١٥٧ | حەدیثی نۆهەم |
| ١٥٨ | حەدیثی دەهەم |
| ١٦١ | حەدیثی یازدەهەم |
| ١٦٣ | حەدیثی دوازدەهەم |
| ١٦٦ | حەدیثی سیازدەهەم |
| ١٦٧ | حەدیثی چواردەهەم |

| لاپەڕە | بابـــــەت |
|---|---|

| لاپـەڕە | بابـــەت |
|---|---|
| ٢٦٢ | بابی سی‌یەم : ئەوانەی عومر کورت ئەکەن |
| ٢٦٥ | بابی چوارەم : ئەوشتانەی باعیثی نەگبەتین |
| ٢٧٣ | بابی پینجەم : ئەوشتانەی کە بیرو هۆش زیادئەکەن |
| ٢٧٩ | بابی شەشەم : ئەوشتانەی کە بیرو هۆش کەم ئەکەن |
| ٢٨٠ | بابی حەوتەم : ئەوشتانە کە ئابڕووی ئینسان زیادئەکەن |
| ٢٨٥ | بابی هەشتەم : ئەوشتانەی ئابڕووی ئینسان ئەبەن |
| ٢٨٩ | بابی نوهەم : ئەوشتانەی کە بینایی چاو زیادئەکەن |
| ٢٩٠ | بابی دەهەم : ئەوانەی هۆی زوربوونی رۆزین |
| ٢٩٦ | بابی یانزەهەم : دوعای مەئثوور |
| ٣٠٠ | بابی دوانزەهەم : ئادابی دوعا |
| ٣٠٦ | خاتیمـــە |



